ڕێبازی
بانگەواز
1 _ 2

# خۆ ناســین
# و
# ڕێ ناســین

نووسینی : شەهید سید قطب
وەرگێرانی : کرێکار

ئامادەکردنی : ڕێباز عبدالله

بسم الله الرحمن الرحيم

**الصلاة و سلام على خير خلق الله ...**
**برایان و خوشكانی ئازیزم سڵاو ڕەحمەتی خواتان لێبێت .**
**ئەم نامیلكەی شەهید (سید قطب) م ئامادەكردوە و خستومەتە بەردەست ئێوەی ئازیز بەو هیوایەی كە بتوانم خزمەتێك بە ئیسلام بكەم و ئێوەی خۆشەویست لێی سودمەند بن .**

**ئامادەكار**

## ناسنامەی كتێب

**ناوی كتێب : خۆ ناسین و ڕێ ناسین**

**نوسینی : شەهید / سید قطب**

**وەرگێڕانی : مامۆستا كرێكار**

**ئامادەكردنی : ڕێباز عبدالله**

**دیزاین : پۆلا**

پێشكەشە :

بەو كەسانەی دەیانەوێت ڕێبازی خوا وەكو خۆی بگرنە بەر

---

**پێشەکی :**

کاتێك لەم ئیسلامە دەکۆڵیتەوە ، هەر زوو لایەنە گرنگ و گەورەکانیت بۆ دەر دەکەوێ ، سەرت سوڕدەمێنێ لەو دووریەی خەڵکی لێی . . بۆیە بەسەرسامی یەوە دەپرسی چ نەخشەیەکە وا ئەم ئیسلامەی لەم هەموو { شوێن کەوتوو }انەی دوور خستۆتەوە . . ؟! چۆن ئەم نەخشەیە هەروا ئاسان لەنێو ئەم هەموو { کۆمەڵگە ئیسلامی}انەدا ڕاپەڕێنرا ؟ ! بۆ نەدەکرا زوو بەری بگیرێ و نەهێڵرێ ئەو کارەساتە ڕوو بدات ؟ !
کارەساتی( ئیسلامی بێ موسوڵمان و موسوڵمانی بێ ئیسلام . . )
وای چ نەخشەیەکی گڵاوی دوور خایەنە .

نەخشەیەکە هەموو بوارەکانی ئیسلامی گرتۆتەوە : باوەڕ و عەقیدەی ، فیکروهۆشی ، پەرستن و خوا ووسیتی ، خوو ڕەوشت و نەریتی بارەجۆراو جۆرەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سەربازی و سیاسی و دادوەری . . . هتد . .
جا ئەگەر ورد سەرنجی خاڵەکاسەرەکی یەکانی ئەو نەخشە دوژمنکاریەت دا دەبیی شێواندنی (شەخسی یەت) ی موسوڵمان ، تەوەری سەرەکی نەخشەکەیە هەموو خاڵەکانی تری پەروانەی دوروو بەرین . سەید قوطبی شەهیدیش ~ ڕەحمەتی خوای لێ بێ ~
کەخۆی و براو خوشکەکانی قوتابخانەیەکی سەر بەخۆی کاری ئەمڕۆی ئیسلامەتین - هەرزوو هەستی بەو خاڵەکرد . . بۆیە دەبینی لەهەموو کتێبەکانیدا – بەتایبەتی ئەوانەی لەدوایی تەمەنیدا نوسینی – بایەخی سەرەکی دەداتە پەروەردەکردنەوەی تاکی موسوڵمان ، بەناساندنەوەی ئیسلامەکە پێی و هاندانی بۆ وەرگرتن و ڕاپەڕاندن و بەرگری کردن لێی . بۆیە دەبینی زۆربەی زۆری بگرە هەموو باسەکانی { فی ظلال القران }ەکەی چارەسەری ئەم کێشەیە دەکەن ، مامۆستا ( احمد فائیز ) یش کە قوتابیەکی سەیدی ئازیزە و پەروەردەی قوتابخانەکەی سەر بەخۆکەی ئەوە ، کارێکی زۆر نایابی کرد کە هەموو باسەکانی بانگەوازی خوا وویستی لە (فی ظلال) دەرهێناو لەدووبەرگی سەر بەخۆ بەناوی { طريق دعوة فی ظلال القران } لەچاپی دان .

بەندەش هەر لەو کاتەوەی چاوم بەو کتێبە چاکە کەوت (١٩٧٧) هەروەها دوای ئەوەی لەسالانی (١٩٨٣) بەدواوە دەمان خوێند و دەمان وتەوە ، وەر گێڕانیم بە پێویست دەزانی ، بۆیە هەر ئەو کاتە کەوتمە وەر گێڕانی – بەڵام بەداخەوە لەڕاکە ڕاك و خۆشاردنەوە و خۆ قوتار کردن دەست نوسی ئەم بەشەیم لێ بزر بوو کە وەرمگێرا بوو ،

ئەوجا ساڵ هاتن و چوو . . قەدەری خوای پەروەردگار (بزوتنەوەی ئیسلامی لەکوردوستان / عێراق) بەویستی خۆی بۆی هێنانیە کایەوە منیش وەك خزمەت کارێکی ئەو ، خۆم گەیاندە ڕیزی . . کەلەنێو هێزە خۆشەویستەکانیدا لاوی خوا وویست و دڵسۆز و خوێن گەرم و ئازاو ئازیزم بینی ، گەنج بومەوە و تین و گوڕم تێدا گەشایەوە و کەوتمە هەڵبژاردن و وەرگێڕانی هەندێ کتێبی تر ، لەگەڵ قۆناغی ئێستای تەنزیم و جیهادماندا بگونجێت ، دیتم (طریق دعوة)ەکەی مامۆستا ( احمد فائز) بۆ ئەم دۆخە نوێیەشمان هەر گونجاوە . . . ئەوجا کەوتمە گیانی . . ئەمجارەیان الحمد لله لەوسا چاکتر .

١- ئایەتەکانم گەڕاندەوە شوێنی خۆیان و ژمارەکانم دیاری کردن .
٢- حەدیسەکانم (تخریج) کرد و لەپاشکۆیەکدا نوسیم .
٣- ئەوزاراوەی پێوستی بەڕاڤە بوبێت بە گوێرەی پێویست و توانا ڕاڤەم کردوون .

خوای گەورەش پشت و پەنا بێت بەشێوەی نامیلکەی بچوك بچوك دەیخەینە بەردەست ، چونکە قەوارەی گەورە جگە لە ( خەرجی ) زۆر گوێزانەوەشی هەر گرانە . . داوام لە خوا یارمەتی یەو ، لەخوێنەری ئازیزیش – بەتایبەتی موجاهیدان و موهاجیران – خوێندنێتی نەك هەر خوێندنەوە . خوای گەورەش هاوکارمان بێت لەیەك خستنی ڕاو ڕێباز و ئاواتدا .

والسلام و علیکم ورحمة الله وبرکاته .

کرێکار
پیشاوەر - پاکستان
سەفەری ١٤١٠ - ئەیلولی ١٩٨٩

## : تێبینی یەکی گرینگ :

ناسینی ڕێباز و ڕێڕەوی نوسەران زۆر خاڵێکی کاریگەرە لەزوو تێگەیشتنی مەبەستیاندا .. بۆیە دەبینی ئەگەر نوسەرێکت ناسی و شارەزای ڕاو بۆ چونیان بوویت ، دەست بەجێ دەزانی نوسینەکەی بە چ مەبەستێک و بۆ چ ئاواتێک نوسیوە .

سەید قوطبی ڕەحمەتیش خاوەنی ڕاو بۆ چونێکی سەر بەخۆی ئیسلامی یە ، چ لەمەسەلەی باوەڕ و پەرستن ، چ لەمەسەلەی شێوازی کار و چۆنیەتی بانگەواز و چ لە بزوتنەوە و گەیشتن بە ئامانج دا .

دەتوانین بیری بەرفراوانی سەیدی مامۆستامان لەشێوەی سێ گۆشەیەکدا وێنە بکێشین




گۆشەی یەکەم : عەقیدە

سەیدی رەحمەتی ڕای وایە کە هەر هەموو دین بریتی یە لە :

١. ناسینی خوا : واتە باوەڕ کردن بەخاوەنێتی و پەروەردگارێتی خوا.
٢. پەرستنی خوا : واتە باوەڕ کردن بەوەی کە پەرستن تەنها بۆ خوایە.

لەم دوو خاڵەشدا ڕای وەک و برا سەلەفی یەکانی ئەمڕۆ وایە ، جگە لەچەند بەندێکی ( اسماء و صیفات ) کە سیدی ئازیز هێشتا لێیان یەکڕا نەبوو بوەوە.

٣. حاکمێتی خوا : کە ئەمەش بەڕوکنی سەرەکی یەکخواناسین دەزانێ و زۆربەی نوسینەکانی خۆی و براکەی (( ئەوانەی لەم دوای یە دا نوسیونی )) تایبەتی ئەم خالە سەرەکی یەن .

گۆشەی دووەم : بزووتنەوە

مامۆستا سەید ~ ڕەحمەتی لێ بێت ~ ناهێڵێت بەهیچ شێوەیەک عەقیدەی ئیسلام بکرێتە ((تیۆر)) ێک و مناقەشەی بکرێت . . بەڵکو دەبێ بریتی بێ لەباوەڕ کردن و راپەراندنی دەست بەجێی . . تەنانەت لەو یاسانەشدا کە پێیان دەڵێن : ( ئەحکامی شەرعی ) . . واتە سەید ئەمانەش بە عەقیدە حساب دەکات . . ئەو باسانەش کە خەڵکی دەیان خوێنن و نایانخەنە کار ناو دە نێ ( فقه الاوراق ) بزوتنەوەش بە عەقیدەکە ناو دەنێ(فقه الحرکه ).

<u>گۆشەی سێیەم</u> : کۆمەڵکاری :

سەید ڕای وایە کە عەقیدە ئەگەر بشکرێت بە بزوتنەوە و هەموو موسوڵمانان بەپێی ئەو عەقیدەیان کار بکەن کارەکەیان هەر بێ بەر هەم دەبێ ، هەڵبەتە لەدونیادا تا ئەو کارانەیان یەک نەخەن و نەیکەنە کۆمەڵکاری واتە لەچوار چێوەی تەنزیمێکدا دای نەڕێژن ، نابێ . . ئەوجا دەڵێ : دەبێ تاکی ئەو کۆمەڵە تەنزیمیەش هەر بەعەقیدە گۆش کرێن و لەسەر ڕێبازی قورئانی مەککی پەروەردە بکرێن .
لەسێ گۆشەکەیدا ئەوە دەسەلمێنێ کەبەهەر گۆشەیەک دەست پێ بکەین ، دەبێ ئەو دوو گۆشەیەی تریشی لەگەڵدا وەرگریت .

کەوابوو ئەو (کۆمەڵە تەنزیم) ی یەی لەسەر غەیری (عەقیدە) دادەمەزرێ و بە (مصلحة دعوة) دەڕوا بەڕێوە ، چارە نوسی پەرتەوازەی و شیرازە پسان و تۆپەڵ تۆپەڵ بوونە .

ئەو (کۆمەڵە) ی (عەقیدە)یی یە ، بەڵام بزوتنەوەیەکی واقیعی کردەوەی نیە یان هەڵدەوەشێتەوە یان بەکۆمەڵ دەمرێ . . مردنی سیاسی .

ئەو (عەقیدە)ش کە (کۆمەڵ)ێک دەیکاتە تیۆر و نایخاتە مەیدانی کردەوە ، دەبێتە بیرێکی فەلسەفی پوچەڵ و بەکەڵکی گەل نایەت .

خوای گەورە پشت و پەنامان بێت هەوڵ دەدەین ئەم باسە لە نامیلکەیەکدا زۆرتر ڕوون بکەینەوە .

---

## جاهیلی یەتی ئەمڕۆ

جاهیلی یەت وەنەبێ ماوەیەکی ڕابردوو بێت لەماوە جۆر بەجۆرەکانی مێژوو، بەڵکوجاهیلی یەت بریتیە لەهەموو بەرنامە و دەستورێک کە مرۆڤ پەرستی تێدا دەر کەوێت . . ئەم سیفەتەش لەهەموو پرۆگرامەکانی ئەمڕۆی مرۆڤایەتیدا بەئاشکرا دەر دەکەوێت . . لەهەموو پرۆگرامەکانی سەرزەمینی ئەمڕۆدا مرۆڤ لەمرۆڤی وەک خۆیان ئایدۆلۆژی وبیر وڕاو بەرنامە وڕێباز و ڕێساو یاساو خوونەریت وەردەگرن . . ئەمەش جاهلی یەتە بەهەموو بنەماکانیەوە . . جاهیلی یە تیژەکە بەئاشکرا مرۆڤ مرۆڤی تێدا دەپەرستێ ، هەندێکیان هەندێکی تریان لەجێی خواداناوە و دەی پەرستن .

ئیسلام تەنهاپڕۆگرامی ژیانە کەمرۆڤ تیایدا ڕزگاری بووە . .
چونکە لەئیسلامدا خەڵکی ئایدۆلۆژی و بیر و ڕاوا ڕیساو یاساو خوو نەریتیان لە خوای پەروەدرگارەوە وەر دەگرن . سەریش تەنها بۆ خوای گەورە دادەنەوێنن ، کە گوێ ڕایەڵیش دەبن تەنها گوێ ڕایەڵی شەریعەتەکەی خوا دەبن مل کەچیشیان تەنها بۆ سیستمی ئیسلامە و بەس . . چونکە لەمرۆڤ پەرستی ڕزگاریان بووە و بونەتە خوا پەرست . . . ئەمەش ئەو دوو ڕیانەیە کە لەنێوان ئیسلام و جاهیلی یەت دا هەیە . .
لەجاهیلیەتی ئەمڕۆدا مادە پەرستی هەموو شوێنێکی گرتۆتەوە هەموو لایەنەکانی ژیان بۆ مادده و نرخی مادده تەرخان کراون ، مادده پەرستی بۆتە پەرستن و مادده جێ و ڕێی خەڵکی و شێوازی حوکومیان دیاری دەکات . . ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە . . چونکە نابێ مادده و باری ئابووری وایان لێبێت جێ و ڕێی خەڵکی دیاری بکەن چ جای ئەوەی کارتێکردنیان لەدەست مایەی ڕۆژی دوایدا هەبێت . . مادده پەرستی دەبێتە هۆ کارێکی سەرەکی بۆ خولقاندنی بارودۆخێکی نالەبار ، نەک هەر لەڕۆژی دوایدا بەڵکو لەژیانی دونیاشدا . . مەگەر بەچاوی خۆمان ئەو پشێوی وبەدبەختی یە لەشارستانێتی ئەمڕۆدا نابینین ؟ کەوابوو دەبێ حەتمەن جۆرە بیر و هۆش و بەرنامەیەکی تر بۆ حوکم کردنی ژیانی مرۆڤایەتی بێتەکایەوە ، بیر و هۆشێکی وا کەتەنها ئەو بتوانێ کارزانانە نرخ بۆباری ئابووری خەڵکی دابنێت و ماددەش بەشێوەیەکی وا ئاراستە بکات کە بەختەوەری و هێمنی و خۆشبەختی خەڵکی تێدابێت {قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ} یونس/٥٨ واتە : بڵێ بەفەزڵ و ڕەحمەتی خوا دڵ خۆشکەن ، ئەوە چاکترە لەوەی کە کۆی دەکەنەوە . ئەو پڕۆگرامەی کەحوکمی ژیانی کۆمەڵە مرۆڤێک دیاری دەکات هەر ئەوە کە بارۆدۆخی ئابووری و نرخی مادده شیان بۆ دیاری دەکات . . کەدەبێ مادده تاچ رادەیەک هاوکاری ژیانیان بکات . . چونکە بە پێ ی ڕێسای ئەو پڕۆگرامە یا دەبێتە مایەی بەختەوەری ، یان بەدبەختی کۆمەڵ . . لەبەر ئەمەشە ئیسلام تەنها پڕۆگرامی ژیانە .

ئەم هاتوو هاوارە زۆرەی کەمادە و ماددە پەرستی زلکردووە ، ئا بەم شێوەیەی کەهەموو بیر و هۆش و هەست و نەستێکی خەڵکی گرتۆتەوە ، بەم شێوەیەی کەئەم خەڵکە بێ ئاگایەی کردۆتە ئامێر و شەو و ڕۆژ هەڵپەیانە بۆی و ، ئائەمەی کەمادده پەرستی کردۆتە ژیان و مایەی ڕەنج و تێکۆشانی خەڵکی . . ئائەم هات و هاوارەی شەو و ڕۆژ دەڵی . . بەرهەم بەرهەم . . پارە . . ئائەم هات و هاوارەی کە هەموو داب و نەریت و هەستێکی پیاوانەی بۆدەخرێتە ژێر پێ . . هەروا سادەنیە و . . بەهەوانتە نەهاتۆتە کایەوە . . . بەڵکو بە پێی نەخشە یەکی وورد دەڕوات ، بۆ دانانەوەی ( بت ) انێکی وا کە لەجێی بتەکانی

جاهیلی یەتی پێشوو بپەرسترێن .. بتی وا وەکو هی پێشان دەسەلاتی بەسەر هەموو هەڵسووکەوتێکی تاک و کۆمەڵدا هەبێت ...
هەر کاتێک و لەهەر جێ یەک پارەو بەرهەمی ماددی بووە بت وخەڵکی ڕەنجیان بۆداو ، بە پیرۆزی یەوە وەک بت لەدەوری گەڕان ئەوا ئیتر هەرچی ئیعتیباراتی تر هەیە دەخرێتە ژێر پێ و دەکرێتە قوربانی ئەو . . خوو ڕەوشت ، خێزان ، ئابڕو ، سەربەستی و هەموو شتێکی پیرۆزی تر ئەوجا لای خەڵکی وای لێدێت هەرچی شتێک بووە کۆسپی ڕێ ی مادده و پارە کۆ کردنەوە ، دەبێ بشکێنرێ و لادرێ . . ئەمەشە مانای بت پەرستی . . ئەگەر ئەمە بت پەرستی نی یە ئەدی بت پەرستی چی یە و چۆنە ؟
مەرج نیە بت هەر لە دار و بەرد داتاشرێ ... نا ... بەڵکو هەواو هەوەس ، لافیتە و دروشمێک . . یا نازناو و پلە و پایەیەک ، یاهەر جۆرە ئیعتیبارێکی تر دێت و دەشێ بکرێتە بت .
لەڕاستیدا نرخی سەرەکی و دەست مایەیی ڕاستە قینە دەبێت تایبەت بێ بە فەزڵ و ڕەحمەتی خوا ، کەلە بەرنامەکەیدا دەردەکەون . ئەو بەرنامە جوانەی کە هێمنی بەدڵ دەبەخشێ و گەردن ئازاد دەکا و هەست و هۆشی مرۆڤ بەڕیزەوە دەپارێزێ . .
لەژێر سایەی ئەم تاکە بەرنامەیەشدا دەتوانرێت سوود لەو ڕۆزیە وەر بگیرێت کە خوای گەورە بۆ خەڵکی سەر زەمینی داناوە . . چونکە ڕۆزی و پارە و شێوازە پێشکەوتوەکانی بەرهەمی ماددی ئەگەر بە پێی بەرنامە جوانەکەی خوای گەورە نەبوو دەبێتە مایەی بەدبەختی و کوێرە وەری خەڵکی . چونکە دەکرێنە ئامێر و ، لەبەڕێز کردن گەورەکردنی ڕەوشتی ئاژەڵیدا لەسەر حسابی ڕیزی بەکار دێن .

---

## بانگەوازی نوێ و سێ خاڵی لاوازیمان

هەر دەبێ بانگەوازێکی نوێ بێتە کایەوە ، تا ئەو خەڵکە لەو مردنە ڕاوەستاوە دەر بهێنێت و بیانخاتە نێو ژیانێکی بەرفراوانەوە . هەر دەبێ بانگەوازێکی وا هەبێ ڕێز و ئابڕوو ، ووزەی ئەو خەڵکە بپارێزێت و نەهێڵێ زیاتر بخرێنە ژێر باری زەلیلی و بت پەرستی نوێوە . . ئەو زەلیلی یەی وای لەمرۆڤ کردوە ملی بۆ مرۆڤی وەکو خۆی کەچ بکات و ، بۆی بچەمێتەوەو ، سوجدەی بۆ ببات . هەردەبێ بزووتنەوەیەکی نوێ بێتە کایەوە تا بانگەوازی خوا وویستی وەکو خۆی بخاتە ڕوو . جاپێش هەموو هەنگاوێک دەبێ داعیەکان ( ئەوانەی گوایە خۆیان بەهەڵگری پەیامی ئیسلام دەدەنە قەڵەم)
هۆی ئەو لاوازیانە بخەنە ڕوو کەتوشی موسوڵمانانی ئەمڕۆ بووە . پاشان دەبێت هەوڵی چارەسەر کردنی بدەن ، ئەوجا ڕاپەڕن و کۆڵی ئەمانەتە خوای یەکەیان بەو پەڕی ورەی بەرزەوە هەڵگرن ..

سێ هۆی سەرەکی هەن بۆئەم لاوازی یە دەبێ زوو دەست نیشان بکرێن و هەوڵی چارەسەر کردنیان بدرێ :

1. **<u>نەبوونی تاکی موسوڵمان</u>**

دەبێ داعیەکان ئەوەچاک بزانن ، کەهۆی سەرەکی لاوازیان و ، گەورەترین دیژواریەک کەتوشی شەخسیەتی موسوڵمانانی ئەمڕۆ بووە ، بریتیە لەنەبوونی تاکی موسوڵمانی لێهاتوو .
لاوازیەکە ئەوەیە کەتوشی گەنجەکانیان بووە . .
خۆ سەخت ترین دەردیش ئەوەیە کە لەخۆیدا بێت و پەی پێ نەبرێ ، چونکە چارەسەری هەموو گیرو گرفت و کێشەیەک ئاسانە ، ئەگەر تاکە کانی کۆمەڵ واقیعیانە پەروەردەکرابن .
بەڵام کارەساتی بەزین و تێک شکان ، کاتێک دروست دەبێ کەئەو جۆرە پەروەردەیە نەبێ ، بۆیە کێشە لەسەر کێشەو نارەحەتی لەسەر نارەحەتی دێتە رێ .
پیاوی لاوازیش عادەتی وایە کە شتی تری (غەیری خۆی) دەکاتە هۆی لاوازیەکەی . .
هۆی وا کە گوایە ئەوەندە گەورەو سەختن کەئەم ناتوانێ لایان دات ، ئەوجا هەر بۆ هەنجەت و بەهانە دەگەرێ ، تابەعوزر بیان هێنێتەوە بۆ لاوازیەکەی خۆی . ساڵە های ساڵە واپەروەردە بووین . . فێرین (غەیری خۆمان) بکەینە هۆی دوا کەتویی و لاوازی و بەزین و نەبووی یەکەی خۆمان ،
جا جارێک ئیمپرالیزم تاوان بار دەکەین ، جارێک نەوەو قۆناغی رابردوو ، جارێکی دیش ئەو کۆمەڵگایەی تێیدا دەژین . . کەسێ خۆی ناکاتە هۆ ! کەس ناڵی ئاخر دەبوو من بایەخم بەخۆم زیاتر بدایە .

**نموونەیەکی قورئانی** :

قورئانی پیرۆز مرۆڤ خۆی دەکاتە خاڵ و تەوەری سەرەکی لەهەموو شتێکدا . . خوای گەورە بەوپەڕی ڕوونی و ئاشکرای یەوە ئەوە دەر دەخات کەهۆی سەرەکی کوڵە و کۆمەڵگەی مرۆڤ هەر مرۆڤ خۆیەتی . . دەفەرموێ {أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّىٰ هَٰذَا ۖ قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} ال عمران/١٦٥ واتە : ئەوە بۆ کە ئەو نارەحەتیەتان تووش بوو (تێک شکانەکەی غەزای ئوحد) کەلەوەوپێش هی ترتان تووش بو بوو وتتان ئەوە بۆ وامان بەسەر دێ ؟ پێیان بڵێ : ئەوە خەتای خۆتانە ، خۆتان هۆ

ڕوودانــی ئەو کارەســاتەن .هەروەهــا خــوای گەورە کەبەســەر هــاتی هــۆزی بەنوالنضــیر ((١))
دەگێــڕێتەوەو باســی تێــک شــکانیان بەدەســتی موســوڵمانان دەکــات وخۆیــان دەکــاتە هــۆی
بەزینەکەیان و دەفەرموویێت : { مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا ۖ وَظَنُّوا أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ اللَّـهِ فَأَتَاهُمُ اللَّـهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا ۖ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ الرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِي الْمُؤْمِنِينَ فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ} الحشر/٢ واتە : واتــان گومــان نەدەکرد کە خۆ تەسلیم کەن و ، لەقەڵاو قوڵــە یان بێنە دەرەوە ، خۆشیان هەر وایان دەزانــی کەقەڵاو قوڵــەکانیان بەرگریــان لێدەکەن و ، نــاهێڵن خوایــان بگــاتێ بەڵام خــوای گەورە لەوشوێنەوە بۆیــان چــوو کەحســێبیان بــۆ نەکردبــوو تــرس و بیمیشــی هاویشــتە دڵیــان ، بــۆیە لەتاوانــدا بەدەستی خۆیــان و بەدەســتی موســوڵمانان ، ماڵەکــانی خۆیــان دەڕووخانــد . جــائێوەش ئەی خاوەن چاو و بیران لەمەوە پەند و ئامۆژگاری وەرگرن . (بنو النضير) چەک و تفاقی شــەڕیان کەم نەبوو ، ژمارەیان کەم نەبوو ، بێ سەنگەر نەبوون ، بەڵام ئاشکرایە هــۆی بەزیینەکەیــان هەر خۆیان بوون ، پێغەمــبەریش (ﷺ) دەفەرموێت { ولینــزعن اللــە المهــاب مــن قلــوب عــدوکم ولیقذفن الوهن فی قبلوبکم ، قالوا یارسول الله ما الوهن ؟ قال : حب الــدنیا وکراهیــە المــوت} واتە : (( پاشان خوای گەورە ترس و بیم لەدڵی دوژمنەکانتــان دەر دێنــێ و ، بەزیــن دەهــاوێتە دڵی ئێوە . . ووتیــان : ئەی پێغەمبەری خوا بەزین چی یە ؟ فەرمووی : خۆشەویســتی دوونیــاو بوغزاندنی مــردن )) ئەم حەدیســە ((٢)) پیــرۆزە ڕێســایەکی گەورە لەڕیســاکانی گــۆڕانی کــۆمەڵ دەخــاتە ڕوو ، ڕواڵەت و جەوهەری ئەو قۆنــاغە ئاشــکرا دەکــات کە کــۆمەڵکی فیطــرە پــیس ( ئەوانەی خۆشەویستی دوونیا دڵ و دەروونیان دادەگرێ) لەڕێیاندا دەیگەنێ وە ناتوانن نە لێی تێپەڕن ونە لێی لابدەن .

هۆی ڕاستەقینەی بەزین خــۆییە نەک دەرەکــی ، بــۆیە نابێــت گلــەی لەوڕەشــە بــایە بکەیــن کە هەڵــدەکات و ملــی درەختێکــی گەنــدەڵ ،(کلــۆر) دەشــکێنی ، بەڵکــوو گلــەی لەدرەخــتەکە خــۆی دەکرێت قورئانی پیرۆز چۆنێتی دۆزینەوەی ئەم ڕاستی یە ڕوون دەکاتەوە ، هۆی تێک شکان و بەزینی میللەتان دیاری دەکات ، ئەوهۆکارە سەرەکی یە باس دەکات کەدەبێتە هۆی درووست بوونی زوڵم و ستەم و دەست درێژی لەکۆمەڵدا ... ئەو هۆیەش هەر مــرۆڤ خــۆیەتی ، ئەوەی دەشــی هێنێــتەوە ئەو بــاروودۆخە نــاهەموارە ، جموجــوڵ و هەڵنەســوڕانی خــۆیەتی ، بەو شێوەیەی کەدەبێ بکرێت : خوای گەورە ئەو سیفەت و ڕەواڵەتە ناو دەنێت ( ظلم الــنفس ) واتە : لەخۆستەم کردن ، بۆیە لەزۆر شوێنی قورئاندا دەفەرمــووێ { وَمَا ظَلَمْنَاهُمْ وَلَـٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ} النحل / ١١٨ واتە : ئێمە ستەممان لێنەکردن بەڵکو خۆیان ستەم لەخۆیــان دەکەن ، وەلە حەدیســی قودسیشــدا ((٣)) هــاتووە کە{فمــن وجــد خیــرا فلیحمــد اللــە ومــن وجــد غیرذلک فلایلــومن الانفســە } ((٤)) واتە : (( ئەوەی چــاکەی هــاتە ڕێ باســوپاســی خــوا بکــات ، ئەوەی شتی تریشی هاتە ڕێ ، بالۆمەی کەسی غەیری خۆی نەکات )) تەنــانەت مــافی لــۆمە و گلەیمان لەشــەیتانیش نــی یە بــیکەین ، مەگەر خــوای گەورە باســی شــەیتان نــاگێڕێتەوە کەلە ڕۆژی دوایدا ( کەتینی بۆ دێ ) دەڵێ : {وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الْأَمْرُ إِنَّ اللَّـهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ

الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ ۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي ۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوا أَنفُسَكُم} ابراهيم / ٢٢ واته : (کاتێ کار گەیشتە ئەنجام شەیتان دەڵێ خوای گەورە پەیمانی حەق و ڕاستی پێدا بوون منیش پەیمانم دابوونێ ، بەڵام من پەیمانی خۆم نەبردە سەر ، خۆ من هیچ ددەسەڵاتێکم بەسەرتاندا نەبوو ، تەنها ئەوەندە نەبێ بانگم کردن (( بۆ ئەو مەبەستانەی من دەم ویستن )) ئێوەش هاتن بەدەنگمەوە ، جا ئیتر بۆ لۆمەی من دەکەن ، لۆمەی خۆتان بکەن .

٢. دوور خستنەوەی ئیسلام

بەزین ، بووی موسوڵمانان گەیشتۆتە ڕادەیەکی وا کە دوژمنانی ئیسلام بەوەوە ناوەستن کە پیاو خراپ بنرێنە نێو ڕیزەکانیانەوە ، بەڵکو هەوڵی گۆڕینی مێشک و بیر و ژیریشیان دەدەن ، ئەوەتا (زوەیمەر) قەشەی مەسیحی لەو وتارەیدا کە لە کۆنگرەی موبەشیرەکاندا دای (ئەوانەی مەسیحێتی لەجیهاندا بڵاو دەکەنەوە) لەناوچەی (جبل الزیتون) ی قودسی پیرۆز، لەسەردەمی دەسەڵاتی ئینگلیزی داگیر کەردا ، دوای ئەوەی گوێی لە وتاری بەشدار بوانی کۆنگرەکە گرت ، کەهەر یەکەیان گلەی و گازندەی هەبوو ، گوایە بڵاوکردنەوەی مەسیحێتی لەجیهاندا کارێکی نەزۆکی بێ بەرە ، زوەیمەر وتی : (ئەی برایانی پاڵەوان، بەڕاستی ئێوەی ئازیز بەجوانترین شێوە ئەرکی سەر شانی خۆتان جێ بەجێ کرد ، ئەگەر چی وا هەست دەکەم کەهەندێکتان لەگەڵ ئەوەی کەزۆر بەڕێک و پێکی کارو باری خۆی بەجێ هێناوە دەرکی ئامانجە سەرەکی یەکەی تەبشێری نەکردووە . . منیش وەک ئێوە لەو باوەڕەدام کە ئەو موسوڵمانانەی بوونەتە مەسیحی یەکێکن لەم سێ بەشە :

١) یان منداڵ بوون و هێشتا فامی ئیسلامەتی یان نەکردۆتەوە.
٢) یان کەسانێکن کە ئەصلەن گاڵتەیان بەدین دێت .
٣) یان ئەوکەسانەن کەدەیانەوێ لەڕێی گۆڕینی دینەکەیانەوە بەرژەوەندی خۆیان ببەن بەڕێوە ، بەڵام ئێوە دەبێ ئەوە بزانن کە کاری سەرەکی ئێمە ئەوە نیە کە موسوڵمانەکان بکەینە مەسیحی ... نا ... ئەمە هیدایەتدان ڕێزلێنانێکی گەورەیە ،کە موسڵمان شایەنی ئەوە نی یە !!

کاری سەرەکی ئامانجی بەرنامەکەمان ئەوەیە ئەم موسوڵمانانە لەئیسلامەکەیان بهێنینە دەرەوە و بیانکەینە مرۆڤی دوور لەخوا . . تاوایان لێدێ کەهیچ خوو ڕەوشتێکی وایان پێ نامێنێ و میللەت و نەتەوەکانیان ئیعتیمادیان بکەنەسەر . .

بەهێنانەی دی ئەم ئامانجەش ئێوەی بەڕێز دەبنە پێشڕەوی سەربازانی (ئیستیعمار) لەهەموو ناوچەئیسلامی یەکاندا ((٥)).

هۆ برایانی بەڕێز . . لەم ماوەیەدا لەسەرەتای سەددەی نۆزدەهەمەوە تائێستا توانیومانە هەموو بەرنامە و پرۆگرامی خوێندن لەناوچە ئیسلامی یەکان بگرینە دەست توانیومانە دەزگای تەبشیری و کلێساو کۆمەڵە و قوتابزانەی مەسیحیەوانی لەهەموو شوێنێکدا دابمەزرێنین .. هەر هەمووشیان

وولآتانی ئەمریکاو ئەورووپا سەرپەرشتی دەکەن . فەزڵ و چاکە لەراستیدا هی ئێوەیە ، چالاکی و وزەی ئێوەیە ، ئێوەن کە بەجۆرەها شێوازی تازەتان توانیوتانە عەقڵ و بیری موسوڵمانەکان ئامادەکەن کەئەو ڕێیە بگرنە بەر کەئێوەی ئازیز بۆتان دیاری کردوون . . ئێوەن لەڕاستیدا کەتوانیوتانە لەوڵاتانی ئیسلامدا نەوەیەک پەروەردەبکەن کە هیچ پەیوەندی یەکی بەخواوە نەماوە و ناشیەوێت بیبێ و ئەوانەش دەبوغزێنێ کەخوا وویستن . . توانیتان موسوڵمانەکان لەئیسلام دەر بهێنن و ئەوەنەوەیە پەروەردە بکەن کە ئیستیعمار دەیویست – لەڕواڵەت وسیفاتی جەوهەریدا – نەوەیەک کە بایەخ بەشتی گەورە نادات . . نەوەیەک کەهەر حەزی لەتەمبەڵی و حەوانەوەی بەر سێبەرە..

نەوەیەک کەهەموو بیر و هۆشی لای دونیاو تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆیەتی . . نەوەیەک حەز لەخوێندنی ڕاستی ناکات . . گەر بشخوێنێت ، بۆتێرکردنی گەدەو فەرجێتی ،گەر سامانی کۆکردەوە ، بۆڕابواردن و ئارەزووی خۆی سەرفی دەکاتەوە ، گەر دەستی لەپلەو پایەیەک گیر بوو ، بۆهێنانەدی ئاواتە شەخصیەکانی خۆی تەرخانی دەکات .. نەوەیەک کەلەپێناوی بەدیهێنانی مەیل و کەیف و سەفای خۆیدا هەرچی شتێ هەیە دەیکاتە قوربانی ((٦)) .

٣. نەناسینەوەی ئیسلام

زۆربەی زۆری زاراوە ئیسلامی یەکان لەجێی خۆیان دا خزێنراون بۆ مانای تر بەکار دەهێنرێن .. بۆیە دەبینی کەئەم خەڵکە واتێگەیشتوون کە بەرزترین پلەی ئیسلام ئەوەیە کە خۆت لە سوچی مزەوگتێکدا بئاخنی و حاڵت لێبێ و خەریکی زیکر و فیکر بیت ، بادڵیشت مەژغوڵ بێت .. با بیر و هۆشیشت خەریک بێ بەشتی ترەوە .

خەڵکی واتێدەگەن کە گۆڕینی کۆمەڵ و بەرهەڵستی کردنی خراپەکاری و جیهاد کردن شتێکی سەرەکی ئیسلام نین وەکو جاران . . لەڕاستیدا فیکر و بیر و هۆش زۆر گۆڕاوە . . تەمومژێکی چڕ بینیمانی گرتووە ، بۆیە ئاوا واتاو زاراوە ئیسلامی یەکان وەک پێویست لەبیر و ژیریماندا دابین نین . . هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ڕێباز و شێوازی کاری جموجوڵی بزافمان گەرەلاوژێ یە . . بۆیە دەبینی باوەڕمان بێتین و دامرکاوەیە . . کەسمان تین و تەوژمێکی وامان نیە ووزەو ورەمان بخاتە کار ، سست و مەستین . . دەردی هەرەسەختیشمان بێدەنگی و کڕ و کپی مەلاو زاناکانمانە . . ماوەیەکی زۆرە زانای وامان تێدا هەڵنەکەوتووە ،وابێ لەڕووی دەوڵەتی ستەم کار و کار بەدەست و دەسەلآت داری زاڵمدا قسەی حەق بڵێ ، و ڕاستی ئیسلامیش بۆ ئەو خەڵکە بێ ئاگایە ڕوون بکاتەوە . ئەنجامی ئەم کڕ و کپی یەی زاناو مەلاکانمان بەرامبەر طاغوتە خوێن تاڵەکان و ، سەر هەڵدان و پەیدا بوونی واتا و زاراوەی نامۆ وا کەهەر گیز لەسەدەکانی سەرەتای ئیسلامدا نەبوون ، ئەم واقیعە پڕ ستەمە دروست بووە . . سەر ئەنجامی ئەو هۆیانە یە ئاوا حوکومڕانە ڕەزا قورسەکان جەماوەری خەڵکەکەیان وەک گا گەل و کەر و وڵاخ بەرە و هێنانەدی ئاواتی پیس و

چەپەڵی خۆیان و ئاغاکانیان خستۆتە پێش خۆ . ئەم سێ نەخۆشیە سەختە : بێدەنگی لەوتنی حەق ، زۆر بوون و سەختی ستەم ، و شێوانی مانای زراوە ئیسلامیەکان ، هۆکاری ئەم بێ کەس و پشێوی و بەدبەختی یەن کە تێیداین . ئەم سێ نەخۆشیە کەلە دوو هۆی سەرەکی یەوە سەریان هەڵداوە :

**(١) نەناسینی حەق** **(٢) نەوتنی حەق**

بۆیە حاکمی وڵاتەکانمان خەریکن خەڵکی لەم تەم و مژەدا پەروەدرە دەکەن .. تاڕاستی نەناسن ، تا چاو و گوێیان بەحەق نەکرێتەوە .

ئاشکرایە ئەگەر خەڵکی حەقیان نەناسی و لەناحەقییان گوێ نەکردەوە شوێنی ناکەون . .
لەم هۆیەشەوەیە کەئیتر بێ بایەخانە دەژین . . خاڵی ( حەق نە ناسین ) نایەتەدی تا جەوهەر و ڕوالەتی حەق ئاشکرا نەبێت و نەناسرێت ، ئەگەر خێر و شەڕ بەتەواوی نە ناسرێن و لێک گوێ نەکرێنەوە ، چۆن چاوەڕوانی ئەوە بین خەڵکی حەقق بڵێن ؟.
طاغوتەکان سوورن لەسەر ئەوەی خەڵکی هەروا گێژو گەلحۆ و کەڕ و بیر ئاڵۆز بمێنێتەوە ..
بۆیە دەبینی ئیسلامەتی – لە لای زۆرکەس – وای لێهاتووە بۆتە نیشانەی زەلیلی و مت بوون و بێغیرەتی !! مامۆستا (ابو الحسنی نەدەوی) دەڵێ : گەورەترین ئەرکی ئیسلامیانەی ئەمڕۆمان ئەوەیە ئەم خەڵکە ڕەش و ڕووتە زۆرەی میللەتە موسوڵمانەکان ، لەئیسلامێکی ڕەواڵەتیانەوە بگوێزنەوە بۆ حەقیقی ئیسلام . . ئەوەش گرنگ ترین و چاکترین خزمەتە لەگەڵ نەتەوەی ئیسلام بکرێ .((٧))

---

## ئەرکی ئێمە

گەورەترین بەڵاو موسیبەت کەتوشی ئەم گەلە موسوڵمانە بووە ئەو تێنەگەیشتنەیانە لە ئیسلام .. کۆسپی هەرە گەورەی ڕێمان ئەو گەڕەلاو ژێ فیکری یە یە کە لەمێکشی ئەم نەوە ئیسلامی یەی ئەمڕۆدا خولقاوە . . بەڕاستی شەڕێکی زۆر سەختە . . بۆیە دەبێ داعیەکان مەیدانی شەڕ و هەموو سەنگەرەکان لێک هەڵاوێرن و ،بەرەکانی شەڕ (کە لەگەڵ کوفرە) چاک دیاری بکەن . . جا لەو ڕێیەشدا زۆر سوار دەگلێن و خەسارەتی زۆریشمان دەبێ و قوربانی چاکیش دەدەین . . دەبێ داعیەکان شارەزای ڕێگاکە بن ، دەبێ بکەونە خۆ . . تین و تەوژمیان بەتین تر کەن . . وورەیان بەرز و متمانەیان بەو پەیمانەی خوای خاوەنیان داویانە . . زۆرتر بکەن پێش هەموو شتێک دەبێ

زانستێکی زۆر و کردەوەیەکی چاک لەم ئیسلامەوە فێر بن ، پاشان دەست بکەن بە وەخەبەر هێنانی خەڵکی . . ئاگاداریان بکەنەوە ..
هەوڵیان لەگەڵدا بدەن . . بێ ئەوەی بێتاقەت بن . . نابێ گوێ بدەنە ئەو هەموو سوار چاکە ئازیزانەی لەڕێدا دەکەون . . دەبێ هەر ئەوەیان لەبەر چاو بێت کە ئامانجەکەیان زۆر گەورەیە .
داعی ئیسلامی بەهیچ شێوەیەک نابێ هێز و دەسەڵاتی دوژمن چاو ترسێنی کا..
نابێ هیچ کۆسپێکی سەر ڕێ بەگەورە سەخت ببینێ . . نابێ هیچ نارەحەتی یەک بەدژوار دانێ . . دەبێ ئەوەی هەمیشە لەبیر بێ کەداعی ئیسلامی ، لەنەوەی کەڵە پیاوانی مێژوە و ،لەم ڕێش سپێتی زەمانەدا زیت بۆتەوە . . داعی ئیسلامی لەکاروانە پیرۆزەکەی پیاوانی بەدر وقادسیە و یەرمووک و حوطەینە . . وەچەی ئەو پیاوە دلێرانەیە . . پاشەنگی سەربازانی بانگەوازە پیرۆزەکەی پێغەمبەری ئازیزە (ﷺ) کە هەتا ئێستاش سالار و قافلەی جیهادن ، دەبێ داعی ئیسلام موجاهیدانە بیسەلمێنێ ، کە کام جێیەی پڕ دڕک و داڵ و دیژوارە ئەم بێ باکانە خۆی تێداوێ . . دەست و گەردن هەڵدەبڕی و بەرهەمی سەر کەوتنی ئەم ئیسلامە لێ دەکاتەوە و دەی چێنێ . داعی یە ئیسلامیەکان دەبێ ئەوەیان چاک لەبەر چاو بێت ، کە ئەمانە پیاوی خوان و ، پەیامە کۆتای یەکەی خوایان هەڵگرتوە و ، جارێکی دی دەبێ دنیای پێ بەختەوەر بکەنەوە . . جارێکی دی خۆ بکەنەوە پێشەواو سەر کردەو ڕێنیشان دەری جیهانیان .

ئەی داعیانی ئیسلام ، طاغوتەکان دەتوانن چیتان لێبکەن ؟.
ئەوپەڕی توانایان ئەوەیە لاشەتان بهێنە ژێر باری ئەشکەنجەو ئازار . . گۆشتتان هەنجن هەنجن و خوێنتان بڕێژن . . ئەمما ڕۆحتان .. بەهیچ شێوەیەک ئەوانە دەسەڵاتیان بەسەریدا ناشکێ . . ئەو ڕۆحەشە کەئێمە هیوامان پێ یەتی . . هیوامان وایە کەهەمووهەست و نەست و ختووری یەکتان تەنها بۆخوا تەرخان کەن و بەس . . خۆشەویستی و بوغز و تکاوترس وحەزتان هەر لەخواو هەر بۆ خوابێت ، هەرواش بژین تا ئەوساتەی گیانتان لەلەشتان دەر دەچێ . . ئەوگیانەمان کەهیچ کەس و هیچ شتێک توانای پێش خستن و دواخستنی نی یە ،هیوادارین ئابەوڕۆحەپاکەوە ، بەباوەڕی دابینەوە ، بەدیداری خوای پەروەردگار وکارزان بەختەوەربین .

داعی ئیسلامی دەبێ لەهەمووکەس و زووتر و زۆر تر هەست بەزوڵم و زۆر بکات و، دژی جاهیلی یەتی سەدەی بیستەم ڕاپەڕێ ، هەروەک کە باوو باپایرانی دژی جاهیلیەتی کۆن ڕاپەڕین .
پێویستە پێش هەمووکەس شەق لەژیانی ماددە پەرستی هەڵداو لێی یاخی بێت . .
وەک نەوەکانی یەکەمی ئیسلام شەقیان تێهەڵداو لێی یاخی بوون.

دەبێ هەمووخۆش گوزەرانی و بەختەوەری و ئاسوودەی یەکیان بکەنە قوربانی ڕێبازە ئیسلامی یەکەیان . . دەبێ زوو بچنە ڕیزی کاروانی سەربازانی پێغەمبەری پێشەواوە (ﷺ) دەبێ خێرا خۆ

بخەنە ژێر سایەی ئاڵا بڵندەکەی خوا وویستی ، ئەو ئاڵا شەکاوەیەی خوا بۆی دیاری کردوون و ، داوای لێکردوون بچنە ژێر سێبەرەکەیەوە..

وەک دەفەرموێ :{ وَجَاهِدُوا فِي اللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِ ۚ هُوَ اجْتَبَاكُمْ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَاهِيمَ ۚ هُوَ سَمَّاكُمُ الْمُسْلِمِينَ مِن قَبْلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ الرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيْكُمْ وَتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ ۚ فَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَاعْتَصِمُوا بِاللَّهِ هُوَ مَوْلَاكُمْ ۖ فَنِعْمَ الْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ النَّصِيرُ } الحج /٧٨ ... واتە : لەپێناوی خودا بەو پەڕی جیددی و ڕاستی یەوە جیهاد بکەن ، خوا ئێوەی بۆ پەیامەکەی خۆی هەڵبژاردووە ، خوا هیچ جۆرە گرێ و گۆڵ و نارەحەتیەکی لەدیندا نەهێناوەتە ڕێتان ، ئێوە لەسەر میللەتی ئیبراهیمی باپیرتانن ، کەئەو لەوەو پێش ناوی ناون موسوڵمانان . . جادەبێ پێغەمبەر شاهیدیتان لەمبارەوە لەسەر بدات و، ئێوەش ببنە شاهید لەسەر خەڵکی . . نوێژ بەجێ بهێنن و، زەکات بدەن و ، دەست بەڕێبازی خواوە بگرن . . چونکە تەنها خوایە سەر پەرشتیارتان ، ئەویش باشترین سەر پەرشتیار و باشترین لایەنگرە . . هۆی سەرەکی سەرکەوتنی داعی وەنەبێ زانای و زۆر زانی و ڕەوان بێژی بێ . . بەڵکو پێش ئەم جۆرە سیفەتانە هۆیەکی تری زۆر کاریگەر هەیە ، کەئەویش باوەڕی ئەو داعی یەیە بە بانگەوازەکەی خۆی کەئەم خەڵکە  بانگ دەکات بۆ وەرگرتنی ، هەروەها ڕادەسی هەسستکردنێتی بەودژوارانەی دێنە ڕێی بانگەوازەکەی ،ئەگەر ئەم بایەخی تەواوی پێ نەدا . . بۆیەدەبێ داعی هەمیشە خەم خۆر بێ . . بەمشور بێ ، بەحەزەر بێ لەومەترسیانەی ڕووەو ڕووی بانگەوازەکەی دەبنەوە . . پاشان دەبێ داعی ئیسلامی وازلە هەرچی ڕابردووی خۆی هەیە بهێنێ و، بەهەمووقەوارەو کیانیەوە بەرەو خوا هیجرەت کا . . بارەگای دونیای بپێچێتەوە و، بەکۆڵێکی سوکی دونیایەوە بکەوێتەڕێ . . . واز لەهەمووشتێکی دونیای بهێنێ و بەتەواوی خۆی تەسلیمی خوای خاوەن و پەورەردگاری بکات ، بەشێوەیەک  هیچ شتێکی خۆی بۆ غەیری خوا نەهێڵێتەوەو هیجرەتیش دەبێ لەبارو دۆخێکەوە بێ بۆ بارودۆخێکی تر . لەحاڵەتێکەوە بێ بۆ حاڵەتێکی تر لەهەمووجۆرە پەیوەندیەکەوە بێ بۆ پەیوەستی خواوویستانە هەر کاتێک ئەم هیجرەتە دەروونیە بەتەواوی دروست بووئەوکاتە ئاشکرا ترین ئەسەریان لەدڵ و دەروونندا بەجێ دێڵێت و کارێکی زۆر قوڵ دەکاتە سەریان باکەڕ و لاڵیش بێت .

# قـورئـان ڕێـبـازە

قورئـانی پیـرۆز بەرنـامەی ئەم بـانگەوازەیە ڕۆحێتـی ، بـوژێنەوەیەتی ، قەوارەو دەسـەلاتێتی ، چاودێر وشوان و پاسەوانێتی قورئانە ڕوون کەرەوە و تەرجومانی ئەم بانگەوزە .
قورئانە پێرەو و پڕۆگرام و ، دەستوری کورت و موختەسـەر ، قورئـان سـەر چـاوەی هەمووکـار و هۆشێکی داعیەکانە ، دەبێ لەوەوە شیوازی کـار و بەرنـامەی بزوتنەوە و تویێشووی ڕێ وەرگـرن {وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ} النحل/٨٩
واتە (( قورئانمان کەبۆ تۆ ناردۆتە خوارەوە ڕوونکەرەو ڕێنیشاندەرە بۆ هەمووشتێک ، و سۆز و بەزەیی وڕەحمەتە بۆ موسوڵمانان)) . بابەت و باسی وخواستی بانگەواز ، لەچەنـدەها سورەت و ئایەتی قورئانی پیرۆزدا باس کراوە . . کە گرنگی و مەزنی و پلەی بەرزی بانگەواز دەر دەخات .
دوژمنانی خوا کۆن و نوێ دەیانزانی کە ئەم قورئانە ورە و هێز و بزوتنەوەیەکی وا لەدڵـی شوێن کەوتوانیدا درووست دەکات ، کە دەست بەجێ پێی دەکەونە کار .
هەموو هێزی دونیاش ناتوانێ کارەکەیان ڕاگرێ یا بێ بەرهەمی کات . . چونکە لەراسـتیدا دەسـتی قەدەری خوای میهرەبان و کردگاری ئەم گەردوونەیە ، کەبـزوتنەوەی موسـوڵمانان دەگـرێتە خـۆو هەڵیدەسورێنێ .

ئائەم قورئانە ئازیزەی ئەمڕۆ وا شوێن کەوتوانی قەدری نازانن . ئەوەندە دەزانـن لەپشـت سـەری ئافرەتی زەیسانەوە ، بۆ دورستنەوەی مۆتەکە دای بنێن . یابیکەنە نوشتە و دوعای بێسەر و بەر! یا زۆر زۆرەکەی بیکەنە جۆرەها ئاوازو، مسابەقەی پێبکەن ، تـابزانن کـام قورئـان خـوێن دەنگـی خۆشترە !!.

ئائەو قورئانەی چەنـدین سـەدەی پڕ مەکر و فێڵ و تەڵەکەبـازی بەسـەردا چـوو . . سەداسـەدەی نەناسـین و نەزانینـی . . کەبـاڵی ڕەشـی کێشـا بـوو بەسـەر بیـر و هـۆش و واقیعـی بـۆگەنی موسوڵمانانداا.

دوژمنانی خوا نەوە دوای نەوە دادەنیشن و لەنهێنیەکانی ئەم قورئانە دەکۆڵێنەوە . .
قسـەو باسـی دووروو درێژیـان لێـوە دەکـرد . . دیراسـەی ئەوەیـان دەکـرد کە چ نهێنـیەکە لەم قورئانەدا ، ئاوا ووزەو هێز و بزوتنەوە دەداتە شوێن کەوتوانی . . ئەوجا پلانیـان دادەڕشـت بـۆ لاواز کردن و نەهێشتنی ئەو هێزە . . نەخشـەیان دەکێشـا کە چـۆن ئەو ورەیە بـڕوخێنن و هێـزە مەعنەویەکەشی بێ ئەسەر کەن . . باسیان دەکرد کە بەچ ڕێیەک دەتوانن واتای وشـەکانی بگـۆڕن و بـیکەن بەچـی ؟ دەبـێ چ ڕێبازێـک بگـرنە بەر تـا ئەم ئـاینە لەوەوە ، کە (هێزێکـی بەردەوام و کاریگەرە ناهەقی لەڕیشەوە دەر دێنێ و ، دەسەڵاتی سەر زەمین دەگێڕیتەوە بۆ حوکمی خوا) ئالەم

هێزەوە بیکەن بە (بزوتنەوەیەکی ڕۆشن بیری ساد و سڕ ، وکەلەپورێکی تیۆری مردارەوە بوو ، یان مناقەشەو دمەوەریەکی فیقهی بەتاڵ) .

ئەمڕۆ بەلایەنی کەمەوە هەفتەی کتێبێک لەجیهاندا بەیەکێک لەزمانە بێگانەکان لەسەر خاڵی ورد و درشتی ئەم دینە دەنوسرێ و بڵاو دەکرێتەوە ! دەربارەی سروشتی ئەم دینە ، دەربارەی مێژووی دەربارەی سەرچاوەی هێزی ، دەربارەی شێوازی بەرەنگاری کردنی ، ڕێگاکانی شێواندن و بەرپەرچ دانەوەی زۆربەشیان وا دەنوسن تا نێتی پیسیان دەزانن هێرش بردنە سەر دین بەشێوەیەکی زەق و ئاشکرا خەڵکیان لێ دەهروژێنێت و ڕق و قین و گیانی بەرگری و بەرهەڵستی تۆڵە لەدڵی خەڵیکدا دەبوژێنێتەوە و بۆیە زۆربەی ڕۆژئاوای یەکان ،
زۆر فێڵبازان – دەکەونە مەدح و سەنناى ئیسلام و باسی ((بلیمەتی)) ئیسلام دەکەن . .
تابەتەواوی هەستی خرۆشاو و حەماسەت و وورەی خەڵکی دەمەێنن لەلایەکی تریشەوە متمانەی خوێنەر و گوێ گرەکانیش بۆ خۆیان کێش دەکەن ، ئەمجا ژەهریان بۆدەکەنە نێو کاسەی باسەکانیانەوەو ،پێشکەشی دەکەن و دەڵێن : ئەمەیە دین !!
دەڵێن ڕاستە دینەکەتان زۆر بەرزە بەڵام پێویستە لەهەندێ لایەنیدا گۆڕان کاری تێدا بکرێت !
گۆڕانکاری لەهەندێ ڕێساو یاسایدا ، تا لەگەڵ شارستانێتی ئەمڕۆی مۆڤایەتیدا بگونجێت !
دینێکی زۆر بەرزە بەڵام پێویستە هەر وەک و باوەڕ و قەناعەتێکی کەسایەتی ، لەدڵ و دەروونی خاوەنەکەیدا بمێنێتەوە !!.

ئای چەن بەرهەمی زرک و تاڵ و کاڵی ئەم پلانە ژەهراویەمان بیست و دیت . . ئەم بالۆرەیەمان لەهەزاران کەسی گێلی خۆمانەوە بیستووە . . ئائەم ژەهری زەقنە بووتە بوو ،
کەبەخوێنی ئەم نەوانەدا تەشەنەی کردوو ، باوەڕیانی کرمۆڵ کرد و بەپوتی فڕێیدایە دەرێ .

ئەم شەڕە دژوارەی دوژمنانی دین ، هەر بەردەوامە و کڵپە دەسێنێ ،بەهیوای ئەوەی خەڵکی هەرهەموویان – لەم قورئانە دور کەونەوە {لاتمسعوا لهذا القرآن والغوا فیه} فصلت/٢٦،واتە: (گوێ لەم قورئانە مەگرن و قسەو گاڵەگاڵی تێدا بکەن) .

لەراستیدا جاهیلی یەتی مەکربازی نوێ ، شەڕێکی سەخت و پڕ فێڵ و تەڵەکەبازی دژی ئەم قورئانە بەرپاکردووە ، و بەهەمووشێوازێک هەوڵدەدا ئەم قورئانە لەسیستمی ژیان دوور بخاتەوە . . چونکە جاهیلیەت زۆر چاک دەزانێ دروست بوونی بزوتنەوەیەکی قورئانی لەدڵی خەڵکیدا ، چ مەترسیەکی پێوەیەو ، چ کۆسپێک دێنێتە ڕێ ؟

گلادستۆن وەزیری یەکەمی بەریتانیا دەڵێ (تا ئەو کاتەی ئەم قورئانە لەنێواندا مابێت ، مەبەست لەوەیە خەڵکی ئەم قورئانە وەک پەیرەو و پرۆگرامێکی ژیان وەر بگرن) ئەورووپا ناتوانێ دەسەڵات بەسەر ڕۆژهەڵات بگرێت و ناشتوانێ دڵنیاو هێمن لەهیچ شوێنێکدابمێنێتەوە) . ((٨))

سەر ئەنجامی ڕاپەڕاندنی ئەم نەخشە گڵاوەیە کە ئەم خەڵکە وای لێهاتووە تەنها ناوی ئیسلامیان پێماوە . . ئەوی قورئانیش دەخوێنێت لەدەزوولەکانی دەنگی زیاتر هیچی ناجوڵێنێت . . . زۆریشیان یابۆ ئاواز و دەنگی خۆش دەیخوێنن ، یابۆنوشتە و موشتە بەکاری دەهێنن . . لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) زۆر بەتوندی بەرهەڵستی ئەوانەی کردوە کە قورئانی پیرۆز دەخوێنن و گوێ نادەنە ئامۆژگاریەکانی ، وەک دەفەرمێ ( الا اخبركم بخير الناس و شر الناس ؟ ان خير الناس رجل عمل فى سبيل الله على ظهر فرسه او ظهر بعيره او على قدمه ياتيه الموت،وان شر الناس رجل يقرا كتاب الله لايرعوى بيشىء منه ) ((٩)) واتە : پێتان بڵێم چاکترین کەس و خراپترین کەس کێ یە ؟ چاکترین کەس ئەو کەسەیە کەمردنی دەگاتێ و لەپێناوی خوادا لەکارایە ، جالەسەر پشتی ئەسپەکەی بێ ، یاوشترەکەی ، یاپیادەبێ ، خراپترین کەسیش ئەو کەسەیە کەقورئان دەخوێنێ بەڵام گوێ ناداتە هیچی .
خوای پەروەردگار زامنێتی پارێزگاری کردن و نەگۆڕانی قورئانی پیرۆزی کردووە وەک خۆی دەفەرموێ(انا نحن نزلنا الزكر وانا له لحافظون) الحجر /٩ .واتە : ئێمە خۆمان قورئانمان ناردۆتە خوارەوەو ئێمەش پارێزگاری ئەوین ، ئەویش هۆیەکی ترە کە وای کردووە لەدوەمنانی خواو دوژمنانی دین ئەو هەموو رەنجە بخەنە گەڕ ، بەهەمووپیلان و فێڵ و کەڵەکەبازیانەوە بۆ یەکخستن و شێواندنی فیطرەی مرۆڤایەتی ، نەبادا وەدەنگ بانگەوازی ئەم قورئانەوە بێت ، بەڵکو قورئان هەر وازی لێبهێنرێت .
مامۆستا حسن الهضيبى دەڵێ : مەگەر نابینی دوژمنانی ئیسلام چەن هێمن و دڵنیان لەمەبەست و بێ ئاگای موسوڵمانان ، چەن دڵنیان لەوەی کە موسوڵمانان هەرچەن قورئان بخوێنن لێی حاڵی نابن . . نابینی گاڵتە پێکردنیان گەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی کە ئایەتی قورئان لەئێزگەکانی ئیسرائیل و لەندەن و نیۆرک و پاریسەوە لێ دەدەن !!

ئەم قورئانە کتێبی خوایە و کتێبی ئەم بانگەوازەیە . . قورئان نورە ،قورئان ڕۆحێکە هەر ئەوەندەی بگاتە دڵی مردوو ،زیندووی دەکاتەوە .
بەهەر دڵ و دەروونێکی غافڵ و بێ ئاگا بکەوێ دەست بەجێ ڕای دەپەڕێنێ و وەئاگای دێنێتەوە . . جائەگەر ئائەم هەموو ملیۆنەها کەسەی کە لافی ئیسلامەتی لێدەداو ، خۆی بەموسوڵمان دەزانێ مانای ژینی نێو قورئانی بزانیایە – ئەو ژینە کە قورئان بۆ شوێن کەوتوانی ڕوون دەکاتەوە و هەموویانی لەسەر پەروەردە دەکات – ئەو کاتە باروو دۆخ و ئەحواڵیان ئابەو شێوە نەدەمایەوە کەئیستا تێیدان . . ئاوا لاواز و زەلیل و بێ دەسەلات نەدەبوون !!

پێویسته لەسەر داعی یەکان زۆر لەبەردەم ئەم ڕاستیەدا بوەستن و زۆریش سەرنجی بدەن هەروەک و پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەبەردەمیدا وەستا . . دەبێ داعی یەکانی ئەمڕۆش هەر لەخاڵی یەکەمی سەرەتایەوە دەست پێ بکەن ،چونکە هێناوەوەی دین و ڕاپەڕاندنی لەسەر ئەو خاله دادەمەزرێ کەدەبێ سەر لەنوێ خەڵکی لەجاهیلیەتەوە دەر بهێرێتەوە و ، لەسفرەوە بخرێنە نێوە ئەم دینه . . ئەمەش خاڵی سەرەکی سەرەتا . دوای ئەم قۆناغەش . . سروشتی یە کە تاقی کردنەوە بە بەڵا و موسی بەت و نارەحەتی درووست بوو ،ئەوجا هەندێ کەس کەتوشی نارەحەتی دێن – لەدینەکەیان پاشگەز دەبنەوە . . هەندێکی تر پەیمانەکەیان دەبەنە سەر کەبەخوای خاوەنی خۆیان داوە ئارام دەگرن و بەردەوام لەسەر ڕێ دەمێننەوە . تاگیانیان دەر دەچی و بەشەهیدی سەر دەنێنەوە . . هەندێکی تریش دەبینی خۆدەگرن ' خۆ ڕادەگرن ' سڵ ناکەنەوە و سوورن لەسەر ئیسلامەکەیان ، وزۆریان پێناخۆش دەبێ بگێررێنەوە بۆ نێو جاهیلیەت ، هەروەکو کە پێیان ناخۆشە فڕیبدرێنە نێو ئاگرەوە .. هەروەها لەسەر ڕێ دەمێننەوە تاخوای گەورە بەحوکمی خۆی داوەری نێوئەوان و گەلەکەیان دەکات ، و پاشان دەسەلات دارێتی فەرمان ڕەواییان دەداتە دەست هەروەکو دایە دەست موسوڵمانەکانی پێشوو . ئەوجا سیستەم و ڕژێمی ئیسلامی جارێکی دی لەسەر زەوی لەسەر پارچەخاکێکی خوا دێتەوە دی .

جاهیلیەتی ئەمڕۆ " لەناوەڕۆکدا هیچ جیاوازی یەکی لەگەڵ جاهیلیەتی کۆندا نیە . ئەوەی وەک جیاوازیش لەنێوانیاندا دەر دەکەوێ تەنها لەروالەتیاندایەو بەس ، بۆیە موسوڵمانانی ئەمڕۆ پێویستیەکی تەواویان بە بانگەوازێکی هۆشیارانە هەیە تاڕاستی دینەکەیان تێبگەیەنێتەوە . . دەبێ شۆڕشێکی ئیسلامی بەرپا بێ . شۆڕشێک بێ تەنها لەپێناوی خوا و جێگیر کردنی حەقدا بکرێت . . شۆڕشی موسوڵمانان کاری هەڕەمەکی بێسەر و بەر نیە بەڵکو بزوتنەوەیەکی ڕێنیشاندانی هۆشیارانەیە ، چونکە خوای خاوەن هەر کاتێک قورئانی ناردبێتە خوارەوە ، یان پێغەمبەرێکی ناردبێ بەمەبەستی ئەوە ناردویەتی کەخوای پەروەردگار خۆی بناغەی کاری جم و جوڵی ئیسلامی دابمە زرێنێت وەک خۆی دەفەرموێ

{ثم جعلناک علی شریعة من الامر فاتبعها} الجاثیە /١٨ واتە : پاشان تۆمان خستە سەر بناغەو شەریعەتێک دەتۆش شوێنی کەوە .

خوای گەورە یاساو ڕێسای خەبات و تێکۆشانی لەپێناوی خۆیدا بۆدیاری کردووین . .

کەوابوو هەردەبێ بانگەوازێکی نوێ بێتە مەیدانەوە .

بانگەوازێک کەشارەزای ڕێبێ و ،دوژمنانیش بناسێت و ،ئاشکرایانە ئاڵای خواوویستی هەڵکردبێ و ، سوور بێ لەسەر ڕێبازەکەی تادەگاتە کۆتای ڕێ .

هەڵگرانی مەشخەڵی خواوویستی هەردەبێ بێنەوە پێشەوە و کتێبەکەی ئەم بانگەوزە خواییە هەڵگرنەوە و بکەونە شوێنی . . هەنگاو بەهەنگاو پێ هەڵگرن و بەو ڕێ یەدا بڕۆن کە قورئانەکەی

خوای زانا دیاری کردووه . . دەبێ دەرس و پەند و ئامۆژگاریش لەو کەڵە پیاوانە وەر بگرن کە بوونە سەرداری قافڵەی خواناسان .

---

## کێ بەرنامە دیاری دەکات

دەبێ ئەو کەسەی کە بەرنامەی گشتی ڕێ یەک دیاری دەکات ، هەر ئەو کەسە بێت کە شارەزای هەموو ڕێگایەکە ، مادام مرۆڤیش بە پێ سروشتی خۆی ڕێگای ژیانی لێ شاراوەیە . تەنانەت نزیکترین ساتی داهاتووشی لەبەر چاوو نی یە و ، چەندین بەربەست ڕێ ی لێدەگرن کەوا بوو مرۆڤ بەهیچ شێوەیەک ناتوانێ بەرنامەیەک بۆ گەشتی ڕێگایەک دیاری بکات ، کەخۆی هیچ شتێک لەو ڕێگایە نازانێت . . لەبەر ئەمەیە کەدەڵین یادەبێ مرۆڤایەتی بکەوێتە گومڕایی و سەر گەردانی و لار و لوێریەوە ، یان دەبێ بگەڕێتەوە سەر ڕێبازەکەی خۆی . . ئەو ڕێبازەی کە لەخوای کردگاری بوونەوەرەوە وەر دەگیرێ .

کەوابوو هیچ کەسێک جگە لەخوای گەورە مافی ئەوەی نیە ڕیساو یاسایەک کە خوای گەورە دیاری کردوە داڕێژێت . ئەو مافە تەنها خوای گەورە هەیەتی چونکە هەر ئەو داهێنەر و کردگاری ئەم گەردوونەیە . . وە تەنها ئەو کارگێڕێ هەموو بەشەکانێتی لەسەر ئەو شێوە گونجاوە گرنگەی کە بۆی دیاری کردوون . . ژیانی مرۆڤایەتیش گۆشەیەکی بچکۆلەیە لەبەشێک لەم گەردوونە گەورەیە ، بۆیە دەبێت کار و باری هەموولایەنەکانی بەگوێرەی یاسایەک بن کە لەگەڵ ئەم یاساگەردوونیانەی دەورووبەریدا بسازێت ، ئەمەش بەیەکێک دەکرێ کە سروشتی هەردووکیان (سروشتی مرۆڤ و سروشتی گەردوون چاک بزانێت )
گومانیش لەوە دا نیە کەهەرچی غەیری خوایە . . کەم و کورتە و پەی بەو هەموو زانیاری یە بەرفراوانە نابات . هەر لەبەر ئەوەشە ناشێ یاسا دانان و ڕێباز دیاری کردن بۆ مرۆڤ بدرێتە دەست مرۆڤ خۆی ، چونکە ئەویش وەکو هەمووشتەکانی تری غەیری خوا کەم و کورتە . . ئەگەر چی ئەمە ڕاستیەکی زۆر ئاشکرایە بگرە بەڵگە نەویستە ، کەچی زۆر کەس هەن یان باوەڕی پێناکەن یان هەر خەریکی مناقەشەکردنین . . هەندێکیان ئەوەنە چاو نەترسن دەڕۆن یاساو ڕێبازی غەیری هی خوا دەهێنن یاهەر خۆیان دەریدەکەن و خەڵکی ناچاری ڕاپەڕاندنیان دەکەن !! لەڕاستیدا ئەمانە یان خۆیان لەخوای گەورە بەزاناتر و لێهاتوو تر دەبینن یان خۆیان بەهاوبەشی خوا دادەنێن ، بۆیە یاسای وا دژ بەڕێبازی خوا دا دەڕێژن ..
بەڕاستی ئەم جۆرە کەسانە چاو نەترس و چاو قایمن خوای گەورە دەفەرمووێ {أَمْ لَهُمْ شُرَكَاءُ شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ} الشورى /٢١ واتە : یان شەریکیان هەیە کەبۆ خوا دایان ناوە ، کەیاساو ڕیسای دینی وایان بۆ دادەڕێژن کەخوای گەورە مۆڵەتی پێنادا .

# بناغەی سەرەکی

خوای پەروەردگار بەپێی زانیاری خۆی بەرنامەیەکی وای بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دیاری کردووە کەلەگەڵ سروشتی مرۆڤ خۆیدا دەگونجێ . کەمرۆڤایەتی دەتوانێ بەهۆ ئەو بەرنامەیەوە بگاتە کۆتاپلەی هاوکاری و هاریکاری نێوان گەلان و تاکەکانیان ، هەروەها هەموو جمو جوڵی کۆمەڵگەکەش لەگەڵ هێزە گەورەکانی گەردووندا دەسازێت . . خوای گەورە ڕێسای سەرەکی گشتی بۆ ئەم هاوکاریانە دارشتووە ، بەڵام مافی دیاری کردن و دارشتنی یاسا لقی یە بچوکەکانی داوەتە دەست مرۆڤ خۆیان و پاشان ئەگەر لەناو خۆیاندا لەسەر کێشەیەک ، یا لەسەر هەڵسووکەوتێک جیاوازیان کەوتە نێوان ، دەبێ زوو بگەڕێنەوە بۆ خوای گەورە ، واتە بۆ ڕێسا سەرەکیە گشتیەکانی ئەو بەرنامەیە کە بۆ ژیانی خەڵکی دیاری کردوون ، ئەو ڕیسا سەرەکیانەش وەک تەرازوو ، دەبێ مرۆڤ هەموو یاساو بەرنامە و شێوازی کار و ڕاپەڕاندنیانی پێ بشکێن . . بەم شێوەیە دەتوانرێ سەرچاوەی یاسا دانان بکرێ بەیەک ، بەم شێوەیەبڕیار دەدرێ ـ کە تەنها خوای گەورە حاکمە و هەر ئەویش چاکترین فەرمان ڕەوایە . . هەموو شێوەیەکی تری غەیری ئەم شێوەیە لەخوایاخی بوونە و دەرچوونە لەشەریعەتی خوا . لادانە لەدینی خوا . لەبەر ئائەم هۆیەیە کەدەبێ فەرمان بکرێ بەچاکەی هەرەسەرەکی کەبریتیە لە :

(( ئیعتیراف کردن بەدەسەڵات و حوکمی خوا ))

واتە : داننان بەوەدا کەدەبێ حوکم تەنها بەبەرنامەکەی خوا بکرێ و بەس .

هەروەها دەبێ بەرهەڵستی بکرێ لەخراپەی هەرەسەرەکی کە بریتیە لە

( واز هێنان لەخوایەتی خوا )، واتە : ڕەفز کردنی حوکمی بەرنامەکەی خوای گەورە . . .

ئەوجا ئەگەر ئەم بناغەیە دارێژرا ، دەکرێ کۆشکەکەشی لەسەر بنیات بنرێت . جا کەوا بوو با هەموو هەوڵ و ڕەنج و تێکۆشانە پەرتەوازە لێک بڵاوەکان کۆبکرێنەوە و هەمووی لەبەرەیەکدا بخرێنە گەڕ ، تابتوانرێت زووتر ئەو تاکە بناغەیە دارێژرێ ـ کەلەسەر ئەوە نەبێ ـ کۆشکەکەمان بنیات نانرێ .

جاری واهەیە پیاو بەزەیی بەو موسوڵمانە دڵ پاک و سەر ڕاستانەدا دێتەوە کەهەموو ڕەنجێکیان دەخەنە گەڕ لەفەرمان کردن بەچاکەیەکی بچکۆلە یا لەبەرهەڵستی کردنی خراپەیەکی بچکۆلە کەلقێکە لە (چاکە یا خراپەی هەرە سەرەکی) . . .

لەکاتێکدا کەهێشتا ئەو بناغە سەرەکیە نیە ، کەژیانی کۆمەڵگەکەی لەسەر دا دەمەزرێ . کەسەر چاوەی هەموو فەرمان کردنێکە بە چاکە و هەموو بەرهەڵستی کردنێکە لەخراپە .

نرخی ئەو ڕەنجە چی یە کەهەر تۆ – بۆنمونە – بەرهەڵستی خەڵکی بکەی لەحەرام خواردن ، لەکاتێکدا کەهەموو لایەنی ئابووری کۆمەڵگەکە لەسەر سوو (ربا) ڕاوەستاوە ؟ کەهەموو پارەی کابرای پێ حەرام دەبێ ، و کەس پاروویەکی حەڵاڵی دەست ناکەوێت ؟ چونکە سیستمی

کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەو کۆمەڵگەیە لەسەر بناغەی شەریعەتی خوا دا نەمەزراوە . چونکە هەر لەسەرەتاوە واز لەخوایەتی خوا هێنراوە ، بەوەی واز لەشەریعەتەکەی خوا هێنراوە و نەیان هێشتووە ئەو ببێتە بەرنامەی ژیان .
جابا بەردی یەکەمی بناغەکە دیاری کەین کەتێ گەیشتنە لەوشەی دین :

---

## ووشــەی دیــن

ئەو دینەی کەخوای گەورە پێی ڕازی یە و دەیەوێ و سنوری بۆ دیاری کردووە ، بریتی نی یە لەهەر جۆرێک لە (( باوەڕ بەخواکردن )) . . بەڵکو بریتی یە لەیەک شێوە لەشێوەجۆر بەجۆرەکانی باوەڕ هێنان بەخوا . ئەو شێوەیەش بریتی یە لەیەک خوا ناسی یەکی پاک و ڕاست و بن بڕ . . بریتیە لەپەرستنی خوای گەورە و بەس ، بەوەی مرۆڤ هەموو ڕووبکەنە ئەو . وەکو هەموو دروست کراوانی تر ڕوویان لەوە . . بەوەی کە دانبنرێ بەوەدا کە تەنها خوا دەسەڵاتی بەسەر مرۆڤایەتی و بەسەر هەموو گەردوندا هەیە . . بەوەی کەهیچ شتێک بێ خوا نابێ و ناکرێ ، هەموو دروست کراوان هی خوان و بۆ خوان و دەبێ ڕویان لەو بێ . . بۆیە دەبێ ئەو دینەی خواشی پێ دەپەرستن هەر ئەوە بێ کە ئەو دەیەوێ کەئیسلامە و بەس ....
وەک خوا دەفەرمووێ { ان ادین عند الله الاسلام } ال عمران /١٩
واتە : ئەو دینەی کەلای خوا پەسەندە ، ئیسلامەو بەس . . ئیسلام دینە . . ئیسلام بریتیە لە خۆتەسلیم کردن بەهەموو دەسەڵاتێکی بەرفراوانی ئەو وەرگرتنی تەعلیماتی ئەو لەهەموو کار و بار و لق و لایەنێکی ژیاندا . هەروەها گەڕانەوە سەر قوئان چونکە قورئانە تەنها سەر چاوەی تەعلیماتی خوای و ، ئیسلامەتی لاف و گەزاف لێدان نیە . ئاڵاو پەرچەمێکی سەوز نیە و هەڵکرێ ، قسەیەکی پوچەڵ نیە و بەسەر زماندا بێت ، تەنانەت ئیسلامەتی ئەو بیر و هۆشە ناسکەش نیە کەلە کونجێکی مات و بێدەنگدا دڵی پێ خۆش دەکرێت . .
هەروەها بەتەنها بەو دروشمە پەرستشانەش ناوترێ ئیسلام کە کەسێک بەتەنها جێ بەجێیان دەکات ، وەک و نوێژ و ڕۆژ و حەج ! نا .... ئیسلامەتی زۆر لەوانە گەورەترە . . ئەمانە ئەو ئیسلامەتیە نین ئەگەر ( لەخەڵیدا نەبوون خوا نەیەوێت ) نەخێر . . کورت و موختەسەر ئیسلام واتە : خۆ بەدەستەوە دان ( خۆ تەسلیم کردن ) .

ئیسلام مل کەچی و گوێ ڕایەڵیە ئیسلام واتە قبوڵ کردنی خوای گەورە لەهەموو کار و بارێکی مرۆڤدا . . ئایەتی {كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِي دِينِ الْمَلِكِ} یوسف/٧٦
واتە : ئا بەو شێوەیە تەگبیرمان بۆ یوسف کرد چونکە بە پێی دینی پاشاکەی میسر نەیدەتوانی براکەی بێنێتە لای خۆی . . ئەم دەقە قورئانی یە زۆر بەڕونی مافی وشەی دین دیاری دەکات . .

دیـن لـەم دەقەدا یـانی سیسـتم و دەسـتوور و یاسـای حـوکمەت ، چـونکە خـوای گەورە کەباسـی سیسـتمی ژیـان و دەسـتور و یاسـا دەکـات بە (دیـن) باسـی دەکـات ، ئـائەم ماناقورئـانیە ڕوون و ئاشکرایەیە کە ئەمڕۆ لەهەموو خەڵکی جاهیلیەتی سـەدەی بیسـتەم شـاراوەیە . . چ ئەو خەڵـکەی خۆیان بەموسوڵمان دەدەنە قەڵەم چ خەڵکە ی جاهیلیەکەی تر ! بەلای ئەم خەڵـکەوە دیـن بـریتیە لەباوەڕ کردن و بەجێ هێنانی درووشمە ئیسلامیەکان . . وادەزانن کەهەر کەس باوەری بەتەنهـای خواو کتێبە ئاسمانیەکان و نێراوانی خوا و خێر و شەڕی قەزاو قەدەر هێناو نوێژە فەرزەکانی کـرد ، ئەوە ئیتر موسوڵمانە و لەدینی خوادایە ، با مل کەچ و گوێ ڕایەڵیشی بـۆ غەیـری خـوا بـێ و لەحاکمێتدا چەندین خواتر هەبن [1] .

لەکاتێکدا کە دەقە قورئانیەکە (دین الملک) بەسیستم و دەستور و یاسای حوکمەت دەر دەبڕێ وشەی (دین ) لەمێشکی ئەم جەماوەرە جاهیلیەدا والاواز و کرژ بوە کەوادەزانن (دین) تەنها یانی ( باوەڕ و بەجێ هێنـانی فەرزەکـان ) . . بەڵام دیـن بەدرێـژای مێـژوو مانـای والاواز کـرچ و کـاڵی نەبەخشیوە ٠ هەر لەزەمـانی حەزرەتـی ئـادەم و نـوحەوە تازەمـانی پێغەمـبەری خۆمـان ؛ درووود و سڵاوی خوا لەسەر هەموویان بێ ؛ بەڵکو هەمیشە ( دین ) بریتی بوە لەمل کەچـی و گـوێ ڕایەڵی خوای گەورە و بەس . بریتی بووە لەوەر نەگرتن و ڕەت کردنەوەی هەر یاساو دەستوورێک لەغەیری خواوە داڕێژرابێت ، هەروەها بریتـی بـووە لەپەرستنی خـوای گەورە لەسـەر زەمیـندا ، هەروە ک و کەتەنهـا ئەو دەپەرسـترێ لەئاسـماندا ٠ واتە چـۆن خـوای گەورە خـوای ئاسـمانانە ئاواش خوای سەر زەمینە ٠ دەبێ تەنها فەرمـانی ئەوی تێـدا بهێنـرێتە دی ، هەروەهـا دیـن بریتـی بـووە لەخـوایەتی خـوا : واتە پەرسـتنی خـوای گەورە و بەڕاپەڕانـدن و بەگەڕ خسـتنی حـوکم و شـەریعەتەکەی و دان نـان بەدەسـەلاتی خـوای گەورە و بەس . . دووڕێیـانی هەمیشـەی ڕێگاکـان هەمیشـە هەر ئەوە بـووە : کـێ لە ( دینـی خـوا ) دایە و کـێ لە ( دینـی پاشـا ) دایە . . ئەوانەی کەلەدینی خوادان تەنها بەسیستم و شەریعەتی خوا ڕازین و تەنها ئەویش ڕادەپەڕێـنن ، ئەوانەش کە لە (دینی پاشا) دان ، بەسیستم و شـەریعەتی پاشـا رازیـن و ئەویـش ڕادەپەڕێـنن ٠ یـان بڵێـین ئەمانە لەڕاستیدا هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن . لەوەدا کەلەلایەکەوە خوا دەپەرستن و باوەڕ بەخوا دێنن دروشمە پەرستنیەکان بۆ ئەو ئەنجام ئەدەن ، بەڵام لەلایەکی ترەوە غەیری خوا دەپەرستن ، چونکە بەسیسـتم و شـەریعەتی غەیـری خـوا ڕازیـن و وەری دەگـرن و ڕای دەپەڕێـنن . . ئەمەش خـــاڵێکی ســـەرەکی دیـــنە و بەڵـــگە نەویســـتێکی عەقیـــدەی ئیســـلامەتی یە .

---

[1] گەر سەیدی ڕەحمەتی بیزانیایە کە لە کۆمەڵگەی کوردەواری ئێمەدا ، ئەوی نوێژ و ڕۆژوو ئیسلامەتیشی نیە هەر بە موسڵمان حسابە و لەدینی خوادایە ٠٠ تەنانەت کەفرِی بەسەر ئیسلامەوە نیە و بەفەقێ و مەلا لەسەر دینی خوا حسابە . . ئاخۆ چی دەوت ؟!

"وەرگێڕ "

# دینی خـوا یـا دیـنی خـۆ

هەندێ لەدڵ نەرم و بە بەزەیەکانی ئەمڕۆ عوزر دەهێننەوە بۆ ئەو خەڵکەی (بێ دین)یشن و هەر بە موسوڵمان ئەیاندەنە قەڵەم ئەڵێن ئەو خەڵکە بۆیە لەسەر ئیسلامی یەتی نامێنێتەوەو، هەوڵ نادەن شەریعەتی خوا (بەوسیفەتەی کەدینە) ڕاپەڕێنن ، چوونکە نازانن (دین)یانی چی . . بۆیە دەبێ ئەگەر جاهیل و موشرکیش بن عوزریان هەر قبوڵ بکرێت .

من تێناگەم ، نازانم ئەم خەڵکە لەڕاستی دینەکە نەگەیشتوون ، چۆن لەسەرەتاوە خراونەتە بازنەی ئەم دینەوە . . ئاخر خۆ باوەڕ کردن بەڕاستی هەر شتێک ، لقێکە لەزانین و ناسینی ئەو شتە . جائەگەر خەڵکی حەقیقەتی ئەو عەقیدەیەیان نەزانی ، چۆن ئیتر پێ یان دەوترێ هەڵگرانی ئەو عەقیدەیە ! ئەگەر نەیان زانی خاڵی سەرەکی باوەڕ چی یە ، چۆن دێنە ڕیزی باوەڕ دارانی یەوە ؟ چۆن بە موسوڵمان دەژمێردرێن کەتا ئیستا نازانن ئیسلامەتی یانی چی ؟!.

خۆ رەنگە ئەم نەزانینەیان لەڕۆژی دوایدا ببێتە مایەی لێ بوردنیان . یان ببێتە هۆیەک بۆ کەم کردنەوەی ئازار و ژان لەسەریان . ڕەنگە لێ پرسرویێتیان بکەوێتە سەر شانی ئەو کەسانەی کەشارەزا بوون و ئەمانیان فێر نەکردووە ڕاستی ئەم دینەیان بۆ روون نەکردونەتەوە . . بەڵام ئەمە مەسەلەیەکی شاراوەو نادیارەو خوای گەورە خۆی دەزانێت لەڕۆژی دوایدا چ حوکمێکیان دەبێ . . مناقەشەکردن و دەمەوەری کردنیش دەربارەی پاداشتی خەڵکی یان سزایان ، لەڕۆژی دوایدا سودێکی بۆ ئیستای ئێمە نی یە ، بەتایبەت کە ئێمە خەریکین و دەمانەوێت خەڵکی بانگ بکەین بۆ ئیسلام ، ئەوەی جێی بایەخی ئێمەیە ئەوەیە کە ڕاستی دینی خەڵکەکە بخەینە پێش چاو، بۆیان بسەلمێنین کەئەوان بەهیچ شێوەیەک لەدینی خوادا نین . . چوونکە دینی خوا بەپێی دەقی ئاشکرای قورئانی سیستم و شەریعەتەکەی خوا . . جاهەر کەس لەسیستم و شەریعەتی خوادا بوو ئەوە لە (دینی خوا) دایە هەر کەسیش لەسیستم و شەریعەتی حوکمەت بێت لە (دینی پاشا ، دینی حوکمەت) دایە ئەوە ڕاستی یەکەو دەمەوەری کردنی ناوێ . ئەوکەسانەی کەنازانن (دین) چی یەو مانای چی یە ، ممکن نی یە خاوەن باوەڕ بن پێ ی ، چونکە نەزانین لێرەدا نەزانینی خاڵی سەرەکی بناغەی دینە ، کەبەگوێرەی عەقڵ و بەگوێری واقع هەر کەس نەیزانێ ، بە باوەڕ دار پێ ناژمێردرێ چونکە باوەڕ لقێکە لە دەر کردن و زانین ئەمەش بەڵگە نەویستە .

چاکتر لەوەی بەرگری لەو خەڵکە بکەین (کە لە دینی خوا نین)و عوزریان بۆ بێنینەوە و لەخوا ی گەورە بە بەزەیی تر بین بەرامبەریان ، کەخۆی ماناو سنووری دینەکەی خۆی بۆ دیاری کردوون . . چاکت لەوە ئەوەیە بکەوینە ناساندنەوەی ڕاستی (دینی خوا) بەو خەڵکە ، تاسەر لەنوێ بێنەوە ناوی یا رەتی کەنەوە . ئەمە باشترە بۆ ئێمەش و بۆ ئەوانیش . . باشترە بۆ ئێمە چونکە

لەخەتـای گـومڕای ئەو دیـن نەناسـانە قوتـار دەبـین ، باشـترە بـۆ ئەوانـیش چـونکە ڕو بەڕو بونەوەیان بەو حەقیقەتەی کە تێیدان ، ئەوەی کە ئەوان لە دینـی حـوکمەت و پـارت و کۆمەڵەی تردان ، نەک دینی خوا . . لەوانەیە ئەو قسە رەقەشمان وا بەتوندی بیـان هەژێنـێ و یەکسـەر لە جاهیلی یەتەوە بێن بەرەو ئیسلام ، لەدینی پاشاوە دەرچن و خۆ بگەیەننە دینی خواو پێغەمبەران و نێردراوانی خوا – سەلامی خوایان لێبێت – کەوابوو هەڵوێستی داعـی یە ئیسـلامیەکانیش لەهەر جێ و لەهەر کوێ بوون بەرامبەرخەڵکی جاهیل دەبێ وابێت .

دەبێ ئیسلام و شەریعەتی خوا لەنیو خەڵکیدا ڕاپەڕێنرێ ، نەک هەواو هەوەسـی مـرۆڤ . . بۆیە ئیسلام دەیەوێت هەڵوێستی خەڵکی دەر کەوێت . . یاوەر گرتن و ڕاپەڕاندنی شەریعەتەکەی خوا ، یاوەرگرتن و راپەڕاندنی هەواو هەوەسی نەزانان { اهواء الذین لا یعلمـون } هەڵوێسـتێکی تـر جگە لەم دوانە نـی یە ،هەروەهـا ڕێ ی مـام ناوەنـدی لەنێـوان شـەریعەتی پـاک و راسـت لەلایەک و لەلایەکی ترەوە هەواو هەوەسی چەوت و لار نی یە ،ئەوی شـەریعەتە پـاک و راسـتەکەی خـوا واز لێدەهێنێ ، دەیەوێ بە هەواو هەوەس حوکم بکا (هی خۆی یا هی خەڵکـی تـر) لەشـەریعەتی خـوا بترازێ ئارەزوو پەرستی و هەواو هەوەسی ئەو کەسـانەن کە نـازانن . خـوای گەورە بە پێغەمـبەرە ئازیزەکەی (ﷺ) دەفەرمووێ : { ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَـرِيعَةٍ مِّـنَ الْأَمْـرِ فَاتَّبِعْهَـا وَلَا تَتَّبِـعْ أَهْـوَاءَ الَّــذِينَ لَا يَعْلَمُـونَ } سـورة الجاثيــة /١٨ .. واتە : پاشــان تۆمــان خســتە ســەر ڕاو ڕێبــازی شـەریعەتێک ، دەتـۆش شـوێنی کەوەو شـێون هەواو هەوەسـی ئەو کەسـانە مەکەوە کە نـازانن ، ئیسلام تەنها شەریعەتێکە شـایانی شـوێن کەوتـن بێـت ، هەر چـی یاسـاو ڕاو ڕێبـازێکی تـر هەیە هەواو هەوەسەو لە نەزانینە هەڵ قوڵاوە . داعی ئیسلامی دەبێ شوێن شەری عەتەکەی خوا بکەوێت و بەس . . دەبێ واز لەهەموو جۆرەکـانی هەواو هەوەس بهێنێـت ، نـابێ بەهـیچ شـێوەیەک لەڕێ لادا . . تەنانەت بـۆی نـی یە بـڕگەیەکیش وەرگرێت لەهەواو هەوەسـی نەزانـان . . دەبـێ ئەوەش بزانێ کە شوێن کەتوانی هەواو هەوەس هەموو پشتی یەکتری دەگـرن وەک بەرەیەک ، دژی شـوێن کەتوانی شەریعەتی خوا ڕادەوەستن . . لەبەر ئەوە نابێ هەندێ لەشـوێن کەتـوانی هەواو هەوەس بکاتە جـێ ی هیـوای خـۆی ،نـابێ ئومێدی ئەوەی بەتاقمێکیـان بێـت کەسـەری خەن . . ئەم دینـە گاڵتەو گەپ نی یە . . هەموو بەشێکی جیددی یە . . بۆ ئەوە هاتوە حوکمی ژیان بکات . بـۆ ئەوە هاتووە خەڵکی بکاتە بەندەی خوا وایان لێبکات تەنها ئەو بپەرستن . . بـۆ ئەوە هـاتوە دەسـەڵات داری لەنارەسـەنان بسـەنێتەوەو بیـداتەوە بەخـوا . . تـا هەمـوو کـار و بارێـک گەورە و بچـوک بگەڕێــتەوە بــۆ شــەریعەتەکەی خــواو بەس . نەک بــۆ ڕاو ڕیســاو یاســای هەواوە هەوەس . . شەریعەتی خوا بۆ ئەوە هـاتووە تـا حـوکمی هەمـوو ژیـان بکـات . . تـا بەئەحماکەمەکـانی خـۆی ڕووبەڕووی کێشەو پێداویستی یە وا قیعـی یەکـانی ژیـان ببێـتەوە ، وەتـا حـوکمی خـوا بەپـێ ی قەوارەو شێوەو گەورەی یا بچوکی ئەو کێشانە دەر بکات . . ئەم دینە بۆ ئەوە نەهاتووە ببێتە ناز ناوو درووشمی شان و شەوکەتی ئەم و ئەو ! شەریعەتەکەشی بۆ ئەوە نەهێناوە بیکاتە کەرەسـەی

لێ کۆڵینەوەو باس و خواسی توێری دوور لەواقیع ! ئیسلام وشەیەک نی یە بەسەر زماندا بێت و بەس . . بەڵکو ئیسلام بریتیە لە بەرنامەو پێڕەو پرۆگرامێکی تەواوی ژیـان ، کەحەتـمەن کەنـد و کۆسپی زۆری دێتە سەر ڕێ ، چونکە بەرنامەیەکی واقیعی یە بەرنامەیەکە لەسـەر ڕێسـای (لا الـە الا الله) و لەجیهانی واقیعدا ، دێتە دی . . ئیسلام ڕەنجی ئەوە ئەدات کەهەموو خەڵکی بگـڕێتەوە سەر پەرستنی خوای راست و تاک و تەنها . . ئیسلام دەیەوێ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەڵنێ بۆ وەر گرتن و ڕاپەڕاندنی حوکم و شەریعەتی خوا . . ئیسلام بۆ ئەوە هاتووە دەست و پێ ی طاغوتەکان ببرێت . . ڕەگ و ڕیشاڵی ئەو ستەم کارانە لەبێخەوە هەڵکێشێ کە دەسـت درێژیـان کـردۆتە سـەر خوایەتی و دەسەڵاتی خوای گەورە ، بۆ خۆیانیان داپچڕاندووە . . بۆ ئەوە هاتووە تامافی خەڵکی دابین بکات و و دابـی کۆمەڵایەتیـان بـۆ بهێنێـتە دی . . بـۆ ئەوە سـەر زەوی ئـاوەدان بکـرێتەوە و ئەرکـی جێنشـێنیتی خـوا بەگـوێرەی بەرنـامەی خـوا ، جـێ بەجـێ بکرێـت . . ئەمـانەش هەمـووی ئەمانەتن و هەر کەسێک بەتەواوی پارێزراگیان نەکـات ، ئەوە خیـانەتی کـردووە ، خیـانەتی لەو پەیمانە کردوە کە بە خوای خۆی داوەو بەیعەت ( بەڵێن ) ە ی هەڵوەشـاندۆتەوە کەبە پێغەمـبەری پێشەوای داوە (ﷺ) .

خوای گەورە دەفەرمووێ {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّـهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُـوا أَمَانَـاتِكُمْ وَأَنـتُمْ تَعْلَمُونَ } الانفال / ٢٧

واتە : ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە خیانەت لەخواو پێغەمبەرەکەی مەکەن ، وەخیانەت لەو ئەمانەتەمەکەن مەکەن کە خراونەتە ژێر دەستان ، خیانەت دەکەن لەکاتێکیشدا کەخۆشتان دەزانن خیانەتە .

---

## واتـــای دیــن

ئەو ئیسـلامە شەریعەتەکەشـی وەک عەقیـدەکەی وایە لەحوکـوم کردنـی سـیفەتی شـیرک ، یـا لەحوکوم کردنـی سیفەتی ئیسـلامەتیدا . . چـونکە شـەریعتەکەش هەر لەعقیـدەکەوە وەرگیـراوە . بۆیە دەتوانین بڵێین کەشەریعەتی ئیسلام هەر عەقیدەکەیەتی ،چـونکە شـەریعەت کـار وکردەوە و هەڵوێستی واقیعی عەقیدەیە .. ئەمەش ڕاستیەکەو لەقورئانی پیرۆزدا زۆر چـاک ئاشکرا کراوە ، ئەمە ئەو ڕاستیەیە کەواتای (دین) بەشوێن کەوتانی خۆی دەبەخشێ . بۆیە دەبینی سەدان سەدەیە بەهەزاران شێوازی پیس و فێڵاوی هەوڵ دەدرا بۆ شێواندن و لێڵ کردنی ئەم ڕاسـتیە لەدڵـی شـوێن کەوتانی ئەم دینەدا ، تاگەیشتە ئەو ڕادەیەی کەمەسەلەی حاکمێتی خوا تەنانەت لەدڵ و دەروونی زۆر لەشـوێن کەوتە خـوێن گەرمەکانیشـیدا چ جـای دوژمـنە لێزانەکـانی وای لێهـات کە بەتەواوی

حاکمێتی خوا له کێشەی عەقیدە جوێ بکرێتەوە و بکرێ بەشتێکی سەر بەخۆی وا کەدڵ و دوروونی خەڵکی بۆی نەجۆشێ ! وەکو کە دڵ و دوروونیان بۆ مەسەلە عەقیدەی یەکان دەجۆشێ و بەتەنگیەوەن . ! گەیشتە ئەوەی کەحوکمی ئەو کەسەی کە لەحوکمی ئیسلامی دەر دەچی و پێی ڕازی نیە ونایەوێ ، بەکافر و نەدین بەدەر نەژمێرڕێت ، وەک ئەو کەسەی کە لە (عەقیدە) و (پەرستن) دەر دەچی و بەکافر دادەنرێ ، ئەو ئیسلامە هیچ جیاوازیەک ناخاتە نێوان سێ گۆشەی {باوەڕ و پەرستن و دەستوور و یاسا} {العقيدة والعبادة الشريعة} ئەمە ڕاستیەکە و زۆر چاک لەدڵ و دوروونی موسوڵمانانی پێشوودا چەسپی بوو ، بەڵام ئەم هەموو دام و دەزگاو شێوازەی مەشق پێکراوە ، زیرەکانە سەدان سەدەیە لەهەوڵ و کۆششی ئەوەدان لایانی ئەم سێ گۆشەیە لێک بترازێنن . ئەوەبوو وای کرد مەسەلەی حاکمێتی ئاوا لاواز و کرژ و بێ قەدربکرێ . . تەنانەت لەدڵی خوێن گەرمەکانیشیدا ئاوا بوو بەشتێکی سادە و بێبایەخ !! ئەگەر چی قورئانی پیرۆز چەندە ها ئایەتی لەسەر ئەم کێشە سەرەکیە هێناوەتەوە . ئەو کەسانەی کە {حوکم شیرک بەسەر بت پەرستێکدا دەدەن ، بەڵام سڵ دەکەنەوە لەحوکمی طاغوتێکدا یا لەحوکمی ئەوکەسەدا کەحوکمی طاغوتی پێ ڕەوایە و، داوەری دەباتە لای ، ئەوکەسانە لەڕاستیدا قورئان ناخوێننەوە و شارەزای سروشتی ئەم دینە نین . . دەبا هەموو قورئان بخوێننەوە ، با ئایەتەکانی بەجددی وەر گرن.باسەرنج بدەنە ئایەتی {وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ} الانعام / ١٢١ . واتە : ئەگەر مل کەچیتان کردن ئەوا ئێوەش موشریکن ... زۆر کەسی خوێن گەرم و دڵسۆز لەوانەی کە بەتەنگ ئەم دینەوە دێن زۆر جار بێ ئەوەی هەست بەخۆیان و هەڵوێستی خۆیان بکەن . خەنجەری ژەهراوی لەجەرگی ئەم ئیسلامە ئازیزە دەدەن ! بەوەی کە بایەخ بەشتی لاواز و لاوەکی دەدەن ، ئەوانە بەئەم کارەیان ئەو تۆزە باوەڕ و ورە و وزەیەش کەلەدڵی خەڵکیدا ماوە ، لەم لایەنە لاواز و کرچ و کاڵانەدا بەفیڕۆی دەدەن . . بڕیاری ئەوەی کە گوایە دین لەنێو ئەو کۆمەڵگە جاهیلیانەدا هەیە و (بەتەواوی) ئەنجام دراوە ، هیچی وا نەماوە ڕانەپەڕێنرا بێت ، مەگەر جار جارە لێرە و لەوێ سەرپێچیەک یا گوناهێک یاخراپەیەک بکرێت . کەپێویستە راستبکرێتەوە !! ئەم بڕیارە دژوارە دەدەن لەکاتێکدا کەدین هەر لەسەرەتاوە لەسەر بناغەی (بوونی قەوارە) دەوەستێ کەدەبێ ئیسلام لەسیستەم و بارو دۆخێک و کۆمەڵگەیەکدا دەربکەوێ ، کەحاکمێتی (فەرمان ڕەوای) بۆ خوا بێ و بەس نەک بۆ مرۆڤ . بوونی قەوارەی دین پەیوەستە بە بوون و ئەنجامدانی حاکمێتی خواوە ، ئەگەر حاکمێتی خوا نەبوو ئەوا دینیش نیە . ئەو گیروگرفتە گەورەیەی ئیستا دین توشی بووە ، بوونی ئەم هەموو طاغوتە خوێن ڕێژانەیە کە دەست درێژیان کردۆتە سەر مافی خوایەتی خوا و دەسەلاتی خوایەتیان بۆ خۆیان زەوت کردوە ، مافی دەستوور و یاسا ( شەریعەت ) دانانیان داوەتە خۆیان . بەوەی کەحوکمی (گیان و سامان و نەوەی) کۆمەڵگەکەیان دەکەن . . ئەمەش هەر هەمان گیر و گرفت بوو کە قورئانی پیرۆز هەر لەسەرەتایەوە بەم هەموو فەرمان و بەر هەڵستی و بڕیار و رەت کردنانەوە ، ڕوەو کێشە سەرەکیەکە دەبوو کە قورئان زوو زوو باسی دەکرد و دەی بەستەوە بەمەسەلەی خوایەتی و پەروەردگارێتی خواوە . دەیکردە تەرازویەک و

جاهیلی یا ئیسلامەتی ، کافری یا باوەڕ داری کەسان و کۆمەڵگە و بارو دۆخی دەورووو پشتی پێ دەکێشاو ، حوکمی ئەو کەس و بارو دۆخەو کۆمەڵگایەی لەبەر ڕۆشنای ئەو کێشەیەدا دەر دەکرد . . لەڕاستیدا شەڕە سەختەکەی ئیسلام کە بۆ سەلماندنی (بوون)ی خۆی بەرامبەر بە جاهیلیەت دەیکرد ، شەڕی ئیسلام و بێ باوەڕی (الحاد) نەبوو ، تابگاتە ئەو ئاواتەی کە بەدەردی شوێن کەوتووە خوێن گەرمەکانی ئەم دینە دەیڵێن دەبێ (دینداری) بێتە دی هەروەها شەڕێک نەبوو دژی خراپەکاری کۆمەڵایەتی داوێن پیسی و بەدکاری . . ئەم شەڕانە بەرپابوون بەڵام دوای ڕوودانی شەڕێ سەختی سەلماندنی (( بوونی )) ئەم دینە . شەڕە سەختەکەی یەکەم جاری ئیسلام بۆ ئەوە بوو بزانرێت کێ حوکوم دەکات . . واتە : کێ (بوون) ی هەیە . بۆیە ئیسلام هەر لەقۆناغی مەککەوە شەیپوری ئەم شەڕەی لێدا . . هەر لەوکاتەی کەعەقیدەکەی لەدڵی شوێن کەوتەکانیدا دادەمەزراند . . هەر ئەو کاتە پێش ئەوەی باسی سیستەم و لق و پۆپ و شەریعەتەکەی بکات. ئەوشەڕە دژوارەی بۆیە دەکرد تابۆ جیهانیان بیسەلمێنێ کەتەنها مافی حاکمێتی هەیە و هیچ کەس ، تەنانەت چاکترین موسوڵمانیش . نەک هەر ئەوەی کە حەدی ئەوەی نیە کە ئەو مافە بدا بەخۆی یا بەکەسێکی تر ، بەڵکو هەر نابێ ڕێ بدا بەوەی کە کەسێک بیدا بەخۆی یا بەکەسێکی تر . . ئەوجا دوای ئەوە کە ئەو کێشە سەرەکیە بەتەواوی لەدڵ و دەروونی شوێن کەوتوانی ئیسلامدا لە مەککە جێگیر بوو ئیتر ڕاپەڕاندن و جێ بەجێ کردنی هەموو دەستوور و یاساکانی شەریعەتی ئیسلام لەمەدینە ئاسان بوو کۆسپی نەدەهاتە ڕێ . . جا ئەو خوێن گەرمانەی سۆز بۆ ئەم ئیسلامە دەکەن با باش تێفکرن و ، وورد بنەوە، بزانن ئەوان لەچ باس و خواستێکدان و ، ئیسلامیش داوای چی کردوە . بەڵام پێش هەموو شتێک با لەڕاستی واتای (دین) تێبگەن ، ئەوجا سەیری حاڵی خۆیان و دەورووو بەریان بکەن . ئاخر ئەم خەڵکە ئا بەو شێوەیە ئەم دینەیان لێتێک چووە لێ دوور کەوتوونەتەوە . . بۆیە ئابەوجۆرە سەیرە وازیان لەئیسلام هێناوە و ، بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن لەئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە . . ئەمە نەخشەکانی دوژمنانی خوا وویستیە کە خوای گەورە لەقورئانەکەیدا باسیان دەکات و دەفەرموێ {لیردوهم ولیلبسوا علیهم دینهم } الانعام/١٣٧ واتە : تالەدینەکەیان پاشگەزیان بکەنەوە و دینەکەیان لێ بشێوێنن . ئاوا مانا و واتای دین داخزێنراو یەقیان کردەوە و بێ کار کەوتن . . بۆیە ئائەم هەموو خەڵکەش دەبینی ئاوا بیر ئاڵۆزن و ئایدۆلۆژی و بیر و هۆشێکی تەواویان دەربارەی ئیسلام نیە .

---

## ناسینەوەی جاهیلی یەت

ئەم هەموو ئایدۆلۆژی و بیر و باوەڕە تێکەڵ و پێ کەلانە ، ئەم خوو نەریتە کۆمەڵایەتیانەی لەو بیر و باوەرانەوە سەریان هەڵداوە . . هەردووکیان جاهیلیەتی وا دروست دەکەن زۆر قورسترە لەو پالە پەستۆ کۆمەڵایەتیانەی جاهیلیەتی پێشان دروستیان دەکرد . . ئەوەتا ئێمە لەچەندەها

شێوازی جیاواز جیاوازدا خۆمان لەجاهیلیەتی نوێدا دەبینین . ئەم هەمـوو خـوو نەریـتە قورسـەی ژیانی خەڵکی توشێ هەزار نارەحەتی و دەردی سەری کردووە ، کەناشتوانن لەسەر خۆیانی لادەن ، یـاهەر نەبـێ کەمێـک سـوکی کەن . پیشـانگاکانی جـل و بەرگ ئەم هەمووجـۆرە مـۆدێلانەی کەگیرفانی ئەو خەڵکە داماوەی هەڵتەکاندوە . ئەم (باو)ە نوێیانەی کەژیان و بایەخیان دەخوات و خوو ڕوشت و ژیانیان خراپ دەکات ، کەناچاریشن مل ی بۆ کەچ کەن و خۆ بدەن بەدەست تەوژمە بەتینەکانی یەوە .. مۆدێلی جل و بەرگی بەیانیـان ، بەرگی دوای نیـوەڕوان ، بەرگـی ئێواران، بەرگی گەڕان ، جلی ئاهەنگ ، جلی کورت ، جلی تەسک و تەنگ ، جلـی پێکەنـین هێنەر . . یـان ئەو هەموو کەرەستە و ئامرازی خۆ جوان کردنە ، میکیاج چاو و برۆ هەڵگرتن ، قژ بـڕین وکەڤگە کردنی . . ئەم هەموو مۆدێلانەی خەڵکی زەلیل کردوە . . تۆ بڵێی هەروا لەخـۆوە دروست بـبن ؟! یـان کەس و دەزگـای دەسـەلات داری بەدواوەیە ؟! کێیە ئەوەی وا ئەم خەڵکـی نەفـانە بەو تەوژمە وێران کاریە دەخاتە پێش خۆی ؟ بێ گومان ئەوی ئەم پیلانە گلاوانە دەکێشێت ، ئەوپێشانگایانەن کە بۆ مۆدێلی جل و بەرگ {بیوت الازیاء} دا دەمەزرێنن . . ئەو پارەدارە سوو خۆرانەی بانکەکـانن . . ئەوانەی پارەی خۆیان لەو کۆمپانیایانەدا دەخەنە گەڕ تا ڕەنج و بەرهەمەکانیان بخۆن .

ئەوی کارگێڕی ڕاستەقینەی ئەم دەزگـا گـلاوانەیە ، جولەکەکـانن ، ئەوجولـەکـانەن کەدەیـا نەوێ هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی برمێنن تاخۆیان ببـنە دەسـەلات داری جیهـان و هەر خۆیـان حـوکمی بکەن . . بەلام وەنەبێ بەهێزی سەرباز و سوپاو چەکی دیارەوە ئاڕاستەی بکەن .. نـا . . بەڵکو بە بیر و ڕا ، بەخوو نەریت ، بەو ئایـدیۆلۆژیەی شـەیتانیانەی لە قـاڵبی پـێش کەوتنـی خـوازی ڕۆشن بیریدا دای دەڕێژن . . تابتوانێ پاڵەپەستۆ لەسەر خەڵکی دروست بکـات و گەشـەی زۆری پێبـدا تـا دەبێـتە (نەریتـی کـۆمەلایەتی) چـونکە ئەوانە چـاک دەزانـن کە تیـرۆری ڕووت ڕۆڵێکـی وانـابینێ . . بەڵکـو دەبـێ ئەو تیـۆرانە لەسیسـتم ڕژێم و یاسـاو بـارو دۆخـی کۆمەڵگایەکدا دەر بکەوێت . . ئەمە کاری شەیتانە شەیتان . . شـەیتانی جنـۆکە و شـەیتانی مـرۆڤین . . ئەمە هەر جـاهیلی یەتەکەی جـارانە ، بەلام لەشـێواز و وێـنە و ڕادەو دیاردەیەکـدا گـۆڕاوە . . هەر ئەو جاهیلی یەتەی زووە . . مەگەر ئاینی نابینی ئەمـیش هەر لەسـەر هەمـان ڕەگ و قەد وەسـتاوە و لـق و پۆپیشـی هەر وەک لـق و پـۆپی جـاهیلی یەتەکەی پێشـووە . . ئـێمە ئەگەر وا لەباسـی ئەو جاهیلی یەتە تێبگەین کەلەقورئـانی پیـرۆزدا بـاس کـراوە ، کەگـوایە باسـی بیـر و بـاوەڕ و بـارو دۆخێکی ڕابردووە ، ئەمە ستەمێکە ولەقورئانی دەکەین . . چـونکە قورئـان باسـی یەکبـارو دۆخـی جاهیکی ناکـات ، بەڵکـو باسـی هەمووجـۆرە جـاهیلی یەتێـک دەکـات ، لەهەر زەمانێکیـدا بێـت ، هەروەها هەمیشە قورئان بریتی بووە لە بەرنامەی ڕووبەڕوو بونەوەی واقیعە لەڕی لادراوەکـان و ڕاسـت کردنەوەیـان و هێنانەوەیـان بەرەوە پەیـامی خواوویسـتی . . زۆربەی زۆری طاغوتەکـانی ئەمڕۆ کەسەر کردایەتی جاهیلی یەتـی نـوێ دەکەن نـاتوانن – وەکـو کۆمۆنیستەکان – هەڵەوەڕی بکەن و ئینکاری بوونی خـوابکەن و بەئاشکرا دژی دینـی خـوا ڕاوەسـتن ، بەڵکـو پەنـا دەبەنە بەر شێوازی زۆر فێلاوی و پیس ..

دەڵێن : ئێمە ڕێزی دین دەگرین ،چونکە ئێمە هەر لەخۆمانەوە دینی تر نایەنینە کایەوە ، بەڵکو هەموو دەستور و یاسایەکمان کەبۆ کۆمەڵگە دا دەڕێژین – هەر لەسەر بناغەی ئیسلام دای دەڕێژین !! ئەمیش شێوازێکی زۆر شەیتانانە و گلاوە زۆر لەشێوازی کۆمۆنیستەکان گلاوترە . .
چونکە ئەو تۆزە هەست و سۆزە دینی یە ئاڵۆزەی کەلەدڵی خەڵکەکەدا ماوە مەستت دەکات.. ئەگەر چی ئەم هەست و سۆزە بریتی نیە لەئیسلام . . چونکە ئیسلام پێڕە و و پڕۆگرامێکی کردەوەی واقیعی ڕۆشنە ، نەک ئەو هەست و سۆزە ئاڵۆز و پشێوە ئەوجا دێن و سروشت و دینەکەی خەڵکی لەقاڵبی جاهیلیدا دادەڕێژن . . ئەمەش نەخشەیەکی زۆر پیس و شێوازیکی زۆر شەیتانانەیە ، لەولاوە طاغوتەکان بەم شێوە خەریکن ، لەملاوەش زۆر لەخوێن گەرمەکانی ئیسلام هەموو ڕەنج و کۆششیان لەنەهێشتنی خراپەکاری بچوک بچوکدا خەرج دەکەن و ، وزەی خۆیان لەکەنارێکی ڕاستی ئیسلامیەوە دەخەنەگەڕ ، کەکارێکی ئیجابی ناکاتە سەر بارودۆخە جاهیلیەتە موشریکەکەیان کە مافی خوایەتی خوای بۆ خۆی زەوت کردووە ..
ئەوخوێن گەرمانە بەم سۆزە گەرمە گەرۆلانەیان بارودۆخی جاهیلیە موشریکەکەیان بەئیسلام سواغ دەدەن و شەریعەتی تێ هەڵدەسوون . ئەم کارە دژوار و ترسناکەشیان بڕیار دانێکی لاوەکیە کەگوایە ئەم بارودۆخە (جاهیلیانە) لەسەر بناغەی وادامەزراون ناشەرعی نین تەنها ئەوەندەیە جار جارە ، لێرە و لەوێ ، گوناح دەکرێ ، یاسەرپێچی لەفەرمانی خوا لەگۆشەیەکدا ، لەبەشێکدا ، لەلقە یاسایەکدا دەکرێ و بەس . ئێمە زۆر پێویستمان بە بیر خستنەوە هەیە ، چونکە ڕەنجی شەیتانەکان و پیلانە گلاوەکانی خوانەویستان هاتۆتە بەر و ، واتای سەرەکی ئەم دینەیان لەمێشکی خەڵکیدا گۆڕیوە . . کارێکی وایان کردوە کەحاکمێتی بەبەشێک لەعەقیدە نەزانێت ٠٠ تەنانەت خوێن گەرمەکانیش . . مەگەر نابینی چۆن ئەو هەست پاکانە هەر خەریکن بۆ ڕاست کردنەوەی دوروشێکی پەرستن ، یاخەریکی بەر هەڵستی کردنی خراپەکاری یەکی خووڕەوشتی بچوکن ، یاڕەنجی ئەوەیانە لقە یاسایەک راست کەنەوە کەپێچەوانەی شەریعەتی خوایە . . کەچی هیچ قسەیەک دەربارەی حاکمێتی و گرنگی حاکمێتی لەعەقیدەی ئیسلامیدا ناکەن . . دژی خراپە بچووکەکان ڕادەوەستن وهەوڵی گۆڕینیان دەدەن ، کەچی واز لەخراپەی هەرە گەورە دەهێنن کەبریتیە لەدانەمەزرادنی ژیان لەسەر بناغەی خوا وویستی ، بناغەی دژ بەیەک خواناسی واتە لەسەر بڕیار و بیر و هۆشانێکە کەتەنها خوای پەروەردگار بە حاکم دا دەنێت . .
خۆ خوای گەورەش پێش هەموو شتێک ئەوەی بەخەڵکی وتووە کە هیچ جۆرە هاوەڵێک بۆخوا بڕیار نەدەن . ئەمە ئەو ڕیسایەیە کەتاکی مرۆڤی لەسەر پەروەردە دەبێ کەچۆن و چ پەیوەندیەک لەگەڵ خوادا دەبەستێ ، هەروەها بەچی و چۆن کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەهۆی ئەم ڕیسایەوە بەپێوەرێکی نەگۆڕەوە ، دەبەسرێتەوە ، کەهەموو کار و بارێکی ئەو کۆمەڵگەیەی پێ دەپێورێت . نەبادا بکەوێتە بەر ڕەشەباو گەردەلوولی هەواو هەوەس و ئارەزوو ، زاراوەی مرۆڤیانەی وا کە هەر هاوتای هەواو هەوەس و ئارەزووی مرۆڤیانەیە ، لەبەر ئەوە دەبێ هەڵوێستی یەکەمی موسوڵمان دەربارەی هەر عەقیدەیەکی دژ بەئیسلام ، هەر لەیەکەم هەنگاوە وە دەبێ هەڵوێستی

واز لێهێنـان و گـوێ بـوونەوە و ڕەت كـردنەوە بێـت . . هەروەهـا دەبـێ هەمـان هەڵوێستی هەبـێ بەرامبەر بەهەر دەستور و هەر یاساو هەر سیستم و هەر بـارو دۆخێـک کەبڕیـاری حـاکمێتی خـوا نادات . . دەبێ هەڵوێستی ڕەت کرنەوە تەبەڕرا بـوون بـێ لێـی ٠ هەر لەیەکەم سـاتی ناسـینیەوە پێش ئەوەی بچینە ناو ئەو لق و چڵانەی کەلە لـق و چڵەکـانی ئیسلام دەچـن ، یـان پـێچەوانەی ئیسـلامن . . هەر کەسێک ، هەر گەلێک ، هەر کۆمەڵێک یاسـاو دەسـتوری مرۆڤیـان وەرگـرت و پەیڕەویان کرد ئەوا ئەو مرۆڤانەیان پەرستووە ٠ئەمەش ڕوون کردنەوەکەی پێغەمبەری ئازیز(ﷺ) کەدەربارەی جولەکە و ، دیان کە (احبار) و (ڕەهبان)ە کانیان کردبوو بەخوا . . (١)

کاتێک عدی کوڕی حـاتەم هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) و گوێی لێبوو کە ئەم ئـایەتەی ئەخوێنـدەوە {اتخذوا احبارهم ورهبانم اربابا من دون الله} التوبة / ٣١ .... واتە : حیبـر و راهیبەکـانی خۆیـان کردبوە خواو لەجێی خوای گەورە دایـان نـابوون (دەیـان پەرستن ) کە عەدی کـوڕی حـاتەم گـوێی لەمە بـوو وتـی : ئەی پێغەمـبەری خـوا کـوا ئەوان ئەو حیبـر و ڕاهیبـانەی خۆیـان پەرسـتووە ؟ پێغەمـبەری خۆشەویسـت (ﷺ) فەرمـووی : {بلـى انهـم احلـوا لهـم الحـرام وحرمـوالهم الحـلال ، فأتبعوهم فذک عبادتم أیاهم }(٢) واتە : بەڵێ ئەوان حەرامیـان بـۆ حەڵاڵ دەکـردن و ، حەڵاڵشـیان لێ حەرام دەکردن ، ئەمانیش پێڕەوییان دەکردن {مل کەچی تەعلیماتیان دەبوون}
ئەمەشـــــــە پەرســـــــــتنی ئەو قەشـــــــــەو حیبـــــــــر و ڕاهیبـــــــــانە . .

(١) ئەحبار ڕەهبان : بریتین لەپیاوی دینی جولەکە و دیان واتە ،کادیری دینەکەیان .
(٢) ترمذی گێڕاویەتیەوە .

## لـە دیـن لادان

ئێمە لەم زەمانەی خۆماندا زۆر جـۆر شـیریک لەنـاو ئەوکەسـانەدا دەبینـین کەلافـی ئیسـلامەتی و یەکخواناسین لێ ئەدەن ، پلە بەپلەی شیریک بەچاوی خۆمان لەهەڵسوکەوتیاندا دەبینین . .
ئەمرۆ خەڵکی جۆرەها خوایان هەیە کەنێوی (نەتەوە) و (نیشتیمان) و (گەل) .... هتد لێدەنێن ، ئەمانەش هەموو (بتن) بەڵام وەک و شێوە سادەکەی جاران پەیکەریان بۆ دانەتاشراوە ، بەڵام هەر هەموویان سیفاتی خوایەتیان بۆ دانراوە ، قوربانیـان بـۆ دەکـرێ و لەپێاویـا خـوێن دەدرێ ! هەر وەک و کەلەبەردەم بتەکانی پێشودا سـەر دەبـڕان . . خەڵکـی ئەمـرۆش باوەڕیـان بە بـوونی خـوا هەیە بەڵام فەرمانەکانی دەخەنە پشت گوێ و شەریعەتەکەی دەخەنە کەنار . لەکاتێکدا کەفەرمـان و داواکاریەکانی ئەو (بتانە) بەپیرۆز دا دەنێن . گەرچی پێچەوانەی فەرمان و شەریعەتی خواشن ، بگرە زۆر جـار بەتەواوی واز لەشـەریعەتی خـوا دەهێنرێت ! جـا ئەگەر ئەمە خـوایەتی نـیە ئەدی

خوایەتی و شیرک و موشریک یانی چی ؟ پاک و بێ خەوشی بۆ خوای پەروەردگار ئەمانە هەمووی شیرکن و لەجاهیلیەتە بۆگەنەکەی ئەمڕۆدا دێنەوە پێش . . جاهیلیەتی پێشوو زۆر لەجاهیلیەتی ئەمڕۆ بەئەدەب تر بوو ، چونکە لەجاهیلیەتی پێشودا ئەوبتانە وەک – خوا – دا دەنران و قوربانیان لەبەردەمدا سەردەبڕان و دەپەرستران ، وەک هاوەڵێک (شەریک ) بۆ خوای پەروەردگار دادەنران و لەهەست و سۆزی خەڵکیدا خوای پەروەردگار هەر بێ خەوش و پاک و بەڕیز دەژمێردرا ، بەڵام لەجاهیلیەتی ئەمڕۆدا ئەوبتانە بە بەڕێز تر و بەبەرزتر دادەنرێن . . داواکاری فەرمانەکانی ئەوبتانە رادەپەڕێنرێ ، کەچی فەرمان و شەریعەتەکەی خوا واز لێدەهێنرێ و فڕێ دەدرێ . . ئێمە خۆمان هەڵدەخەلەتێنین کەواحساب بکەین کەبت پەرستی تەنها بریتیە لە بت دانان و شێوازە سادە و ساویلکەکەی بت دانان و قوربانی بۆکردنی ، یا وابزانین تەنها بریتیە لەوجۆرە پەرستن و نەزر بۆ کردن و پشت چەماندنەوەی جاران و ، یا ئیعتیبار پێ کردنیان کەتکاکار (شفیع) ی لای خۆیان ٠

لەڕاستیدا تەنها ئەوەی گۆڕاوە شێوەی بت و بت پەرستیە چونکە درووشمی پەرستنەکان زیاتر ئاڵۆز بووە و ، ناونیشانی نوێیان لێنراوە . . ئەمما ڕاستی سروشتی شیریک هەر وەک و خۆی ماوە و، لەشێواز و دروشمە گۆڕاوەکاندا دەر دەکەوێ . . ئائەوەیە کەدەڵێین : دەبێ ئاگاداری بین و هەڵمان نەخەڵەتێنێ و راستیمان لانەشێوێنێ .

خوای گەورە فەرمانی پێداوێن پاکی و پیاوەتی و چاکە خوازی داوە ، (نیشتیمان ) و (پارە)و (بەرهەم) فەرمان دەدەن کەئافرەت بەڕووتی بڕواتە دەرەوە و خەڵکی توشی فیتنە بکات و ببێتە سەماکار ، وەک کچە جیشاکانی ژاپۆنی بت پەرست . ببێتە میوان داری ئۆتێلەکان .((١٠))

باشە خواکامەیە کەدەبێ فەرمانەکانی ڕاپەڕێنرێن ؟ ئایا خوای پەروەردگارە یا ئەم بتانەی لەجێی خوادانراون ؟ .

خوای گەورە فەرمانی داوە کەدەبێ ئەو پەیوەندیەیی هەمووخەڵکی بەیەکەوە دەبەستێ ، عەقیدە بێ و بەس . بەڵام (نەتەوایەتی) یان (نیشتیمان) فەرمان دەدەن کەدەبێ پەیوەندی عەقیدە لە پەیوەندی نێوخۆی کۆمەلگاکانیدا دوور بخرێتەوە ، نەژاد ،یان گەڵ بکرێتە ئاڵقەی پەیوەستی نێوان خەڵکی ؟ باشە خواکامەیە کەدەبێ فەرمانەکانی راپەڕێنرێن ؟ ئایاخوای پەروەردگارە ؟ یا ئەم بتانەیە کە کراون بەخوا ؟ .

خوای پەروەردگار فەرمانی داوە کەدەبێ شەریعەتەکەی ئەو حاکم بێت . . بەڵام لەملاوە کابرایەک یان کۆمەڵێک دەڵێن .... نا دەبێ مرۆڤ خۆیان دەستور و یاساوشەریعەتی خۆیان دابنێن و حوکمی نێوخۆیان هەر بەوە بکەن کەخۆیان دیاری دەکەن . . باشە خواکامەیە کەدەبێ فەرمانەکانی ڕاپەڕێنرێن ؟ ئایا خوای پەروەردگارە ،یان ئەم بتانەی لەجێی خوا دادەنرێن و دەکرێن بەخوا ؟.

ئەمانە هەموو نمونەی ئەو گۆڕانانەن کەلەسەر زەمینی ئەمڕۆدا ڕوو دەدەن کەلەڕاستیدا حەقیقەتی بت پەرستی ئەمڕۆ دەر دەخەن ،حەقیقەتی بتە پەرستراوەکانی ئەمڕۆ دەر دەخەن ، ئەوبتە

نادیـارانەی کەلەجێــی بــتە کۆنەکــان دادەنــرێن و دەپەرســترێن . . بــۆیە دەبــێ بەحەزەر بــین هەڵنەخەڵەتێین و فریو نەدرێین ، دەبـی چـاک بـزانین کەشـیرک و بـت پەرسـتی هەروەک و خـۆی ماوە ، ئەوی گۆڕاوە تەنها ڕوالەت و شێوە و دیاردەکانی بت پەرستین و بەس .

ئەگەر لەژێری مرۆڤایەتی بگەڕێن و ، سەربەسـتانە ئەم واقـیعە ببینـێ هەرگـیز پێـی ڕازی نـابێ و نایەوێ بەڵام ئەوی ڕێی لێدەگرێ هەواو هەوەس و فریـو دان و گـومڕا کـردنە ، ئەمـانەی کەوایـان کردوە لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی – دوای چواردەسەدە لەهاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز - ئـاوا واز لەدین بهێنێت و هەڵگەڕێتەوە و – لەم وێنە نوێیەی جاهیلییەتدا بکەوێتەوە نێو شیرک . . هاوەڵی وا بۆ خوا بڕیار بدات کەهیچی دروست نەکردوە ، بەڵکو خـۆی دروسـتکراوە و ناشـتوانێت خـۆی سەربخات چ جای کەسێکی تر وەک خوای گەورە دەفەرموێت :
{ وَلَا يَسْتَطِيعُونَ لَهُمْ نَصْرًا وَلَا أَنفُسَـهُمْ يَنصُـرُونَ } الاعـراف/١٩٢ واتە : یاهـاوەڵی وابـۆ خـوا بڕیار دەدەن کەهیچیان دروست نەکردووە ، بەڵکو خۆیان دروست کراون، هاوەڵی وابـۆ خوابڕیـار دەدەن کەناتوانن سەر کەوتنیان بۆوەدەست بێنن و خۆیشیان سەر ناکەون .
کۆمەڵگەی مرۆڤـایەتی ئەمـڕۆ هەروەک و دوێنـێ زۆر زۆر پێویسـتی بەوە هەیە بەو قورئـانە خـوا بدوێنرێ . پێویستی بەکەسێکە بێت و سـەر کردایەتـی بکـات و لـەم جـاهیلیەتەوە بیگـوێزێتەوە بـۆ ئیسلام . تالە شەوە زەنگی تاریکی کوفرەوە بیبات بەرەو ڕونـاکی باوەڕ . .
پێویستی بەکەسێکە بێت و ، دڵ و ژێری لەم بت پەرستیە نوێ یە – لەم بێمێشکیە نوێ یەی تێـدا جمەی دێ . ڕزگار کـات هەروەک و لەیەکەم جـاردا هەر بەم دیـنە ڕزگـاری کـرد تـا دڵ و دەروونـی بەباوەڕهێنان بەحەقیقەتی یەکخواناسی ئاوەدان بێتەوەو هەست و هۆشی پێ بخرۆشێت ، تامرۆڤ ئەم گەشتە دووروو درێژەی سەرزەمینی لەبەر ڕۆشـنای ڕێنمـای خـوادا ببڕێـت ، بـروات و چـاوی لەتەنها ئەستێرەی ئاسۆی ژیـان بێـت و لەڕێ لانەدات ، بـڕوات و پشـتی بەتەنهـا سـەرچاوەکەی بوون ببەستێ لەژیان و هێز و ڕۆزیدا . . تەنها سەر چاوەی سوود و زیان . . تەنها سـەر چـاوەی دان و نەدان . . تا لەگەشتی درێژ خایەنیـدا بەرەو ئەو سـەرچاوە ڕێـک و ڕاسـتە بـڕوات . . بەرەو خوا بڕوات و ، هەر لەویشەوە وەرگرێت و لەسەر ڕێبازی ئەو بێت و بەس . . تادڵنیا تر و هێمنتر بێت لەگەیشتنە ئاواتی ، بڕوات و بەحەزەر بێ. بزانێ گەورەکەی چی پێ خۆشـە ئەنجامیـداو چـی پێ ناخۆشە توخنی نەکەوێ . .
جا ئەگەر بەم ڕێبازە و ، بەرەو ئەو ئاواتە و پشتی بەوسەرچاوەیە بەست و ، کەوتە ڕێ،
گومانی تێدا نیە کەهەموو ورە و وزەی لەو ڕێ یەدا سـەرف دەکـات ، چـونکە ئەوجـا پێـی لەسـەر زەمین قایم و چاوی لەخوای تاک و تەنهـای ئاسـمان دەبێـت .. خـوای گەورە دەفەرموێت {ضَـرَبَ اللَّـهُ مَثَلًا رَّجُلًا فِيهِ شُـرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِّرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا ۚ الْحَمْدُ لِلَّـهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ } الزمـر/٢٩ واتە : خـوای گەورە نمـونەی دوو پیـاو دێنێـتەوە کەیەکێکیـان کۆیلەی چەند کەسێکە ، کەهەمیشە لەسەر ئەو ناکۆکیانە و، دووەمیان کۆیلەی یەک کەسە ، ئایا هەر دوو کۆیلەکـانەک یەک وان ؟ خـوای گەورە ئەم نمـونەیە دێنێـتەوە ، نمـوونەی بەنـدەیەکی

یەکخوا پەرست و بەندەیەکی زۆر خواپەرست ، بەندەیەکیان کۆیلەی چەن کەسێکە و کەلەنێوان خۆیاندا ناکۆکیانە لەسەری و ئەویش نازانێ ڕوو لەکامیان بکات . . هەریەکەیان بەجۆرێک ئاڕاستەی دەکەن و هەر یەکەیان فەرمانێکی بەسەردا دەدەن ، ئەویش لەنێوان ئەم هەموو فەرمان و بەر هەڵستیەدا سەگەردانە ونازانێ کامیان ئەنجام بدات لەسەر هیچ ڕایەک خۆی پێ ناگیرێت وناشتوانێت ئەم هەموو هەواو هەوەسە دژ بەیەکە تێکرژاوە لێک هەلاوێرێ و پێکەوە بیان گونجێنێت . . ئەمە یەکیان و ، ئەوەی تریش ، کۆیلەی یەک کەسە ، دەزانێت چ فەرمانێکی بەسەردا دەدەن و چی لێداوا دەکەن ، بۆیە خێرا وەری دەگرێ و ڕای دەپەڕێنێ و پاشان دڵنیا و هێمنانە ستار دەگرێ و دەحەوێتەوە ، چونکە لەسەر یەک پەیڕە و پڕۆگرامی ئاشکراو ڕوون کار دەکات .

---

## مژدە و ئاگاداركردنەوە

{ هَـٰذَا بَلَاغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا بِهِ وَلِيَعْلَمُوا أَنَّمَا هُوَ إِلَـٰهٌ وَاحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُولُو الْأَلْبَابِ}
واتە : ئەمە مژدە یە و ڕوونکردنەوەیەکە بۆ خەڵکی ، تاپێی ئاگادار بکەنەوە و بزانن کە خوا تاک و تەنهایە ، تاخاوەن ژیریەکان لەیادیان بێت . مەبەستی سەرەکی ئەم مژدە و ئەم ئاگادار کردنەوە و ڕوون کردنەوەیە ، ئەوەیە کە هەموو خەڵکی بزانن کە (انما هوالە واحد – خواتاک و تەنهایە) ئەمەش ئەو بناغەیەیە کەئیسلام پڕۆگرامەکەی خۆی – لەژیانێکی واقعیدا – لەسەر دادەمەزرێنێت .
بێ گومان مەبەست لەمە تەنها زانینی نیە ، بەڵکو بریتیە لە دامەزراندن و سازدانی ژیانیان بەگوێرەی ئەوزانینە ، مەبەست لەمە، ڕاپەڕاندنی دینی خوایە ، جالەبەر ئەوەی کە هیچ کەس و هیچ شتێک نیە کەشایانی پەرستن بێت جگە لەخوای پەروەردگار ، کەوابوو هەردەبێ ئەو بپەرسترێت و ، هەر ئەویش حاکم و سەرۆک و سەروەر و هەڵسوڕێنەر و یاسا دانەر و ڕێپیشاندەر بێ ئەوجا دامەزراندنی ژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیش لەسەر ئەم بناغەیە بێت ، ئەمەش جیاوازی یەکی سەرەکی هەیە لەگەڵ ژیانی هەموو جۆرە کۆمەڵگایەکی تری مرۆڤایەتیدا ، کە لەسەر بناغەی خوایەتی مرۆڤ دابمەزرێت . واتە لەسەر حاکمێتی مرۆڤ و پەرستنی مرۆڤ . . ئەم جیاوازی یەیش لەهەموو شتێکدایە ، لەباوەڕ و بیر و هۆش ، لەدروشمی ڕەفتارە پەرستنی یەکان ، لەخوو ڕەوشت و نەریت ، لەڕەسم و عادەت ، هەروەها لەکاروباری ئابوری و کۆمەڵایەتی و هەموولایەنەکانی تری تاک و کۆمەڵدا هەیە .
باوەڕ هێنان بەخوایەتی و دەسەڵات دارێتی خوا ، وەنە بێ بریتی بێ لەئایدیۆلۆژی یەکی ڕووتی وا کەتەنها لەبیر و هۆشدا بچەسپێ ، بەڵکو خوایەتی خوا پڕۆگرامێکی سەر بەخۆیە و هەموو لایەنەکانی ژیانی لەسەر دادەمەزرێ . . سنوری عەقیدە ئەوەندە بەرفراوانە کە هەموو لایەنەکانی

ژیان دەگرێتەوە . . مەسەلەی حاکمێتی لەئیسلامدا – بەهەموو لق و چڵەکانیەوە – مەسەلەیەکی عەقیدەی یە . مەسەلەسەرەکیەکانی خوو ڕەوشتیش – هەر هەموویان مەسەلەی عەقیدەن ، ئەو پڕۆگرامە بەرفراوانەی ژیانیش ، کەخوو ڕەوشت و عادەت و نەریت دەگرێتەوە هەر لەعەقیدە و ئایدۆلۆژیەوە وەردەگیرێ ،هەروەها هەموو بارودۆخ و هەڵس و کەوتێکی تری ژیان هەر عەقیدەین .

ئێمە ئەگەر چوار چێوەی عەقیدەی ئەم دینەمان نەناسی شارەزای نەبووین و ، بەتەواوی لەشایەتمانەکەمان (لااله الا الله محمد رسول الله) نەگەیشتین ئەوا لەمەبەستی قورئان تێ ناگەین کەواتە پێش هەموو شتێک دەبێت لەواتای (پەرستن تەنها بۆ خوایە) تێ بگەین و دینداریتی – بەهەموو لایەنەکانی یەوە – بگێڕینەوە بۆ خوای گەورە نەک هەر لەساتەکانی نوێژدا ، بەڵکو لەهەموو گۆشەو کەلێنێکی ژیاندا ئەو بت پەرستیەی کە حەزرەتی ئیبراهیم ـ سەلامی خوای لێبێت داوای لەخوا دەکرد خۆی و کوڕ و نەوەی لێ لادا ، وەنەبێ هەر لەشێوە سادەکەی بت پەرستی عەرەبەکاندا بوبێت کە لە جاهیلیەتی پێش ئیسلامدا دەیان کرد یان لەجاهیلیەتەکانی تردا کەلەبەرد و دار پەرستی ، یان لە ئاژەڵ و باڵندە پەرستیدا دەر دەکەوێت . . ئەم شێوانەش هەموو جۆرە بت پەرستیەکان ناگرێتەوە و هەموو جۆرە شێوازەکانی شیرک ناگرێتە خۆ ئەگەر ئەوەندە سادە بین وابزانین کەتەنها ئەمانە شیرکن ، ئەوە پەردەیەک دێنین بەسەر بینای خۆماندا . واتە ناتوانین شێوە جۆراو جۆرەکانی شیرک ـ کەکۆتای نایەن ـ ببینین ئەمەش دیسان نایەڵێت حەقیقەتی جاهیلیەت و وێنە جۆراو جۆرەکانی شیرک بناسین . کەوابوو دەبێ زۆر بەقوڵی بەلێکۆڵینەوەدا ڕۆچین ٠ سروشتی شیرک و مانای بت و پەیوەندی نێوان بت و شیرک ، شارەزابین وێنە نوێکانی جاهیلیەتی نوێ بزانین ٠
ئەو شیرکەی کە پێچەوانەی ( لا الە الا اللـە ) یە هەموو جۆرە بارو دۆخ و ڕەوت و وتێک دەگرێتەوە کە بەگوێرەی دینی خوا ناهاتبێتە کایەوە ، حەقیقەتی شیرک لەوەدا دەر دەکەوێت کەکەسێک لەلایەنێک لەلایەنەکانی ژیانیدا ، خۆی بەگوێرەی دینی خوا بگونجێنێت کەچی لایەنەکانی تری ژیان بەگوێرەی ڕێبازێکی تر بێ ، زەقترین نمونەش ، ژیانی ئەمڕۆی مرۆڤایەتیە کە واقیعی ترین نمونەی شیرکی تێدا دەر دەکەوێت .

---

## بتی بێ پەیکـەر

ئەوکەسەی کەباوەڕ بەخوایەتی خوادێنێ و ، دەست نوێژ و نوێژ و ڕۆژوو حەج و پەرستەکانی تری بەپێ ی شەریعەتی خوا بەجێ دەهێنێ ، کەچی لەهەمان کاتدا بۆ باری سیاسی و کۆمەڵایەتی دەچێ لەشەریعەتی غەیری خوای وەردەگرێ ، بیر و هۆش و ڕاو بۆچونی بەگوێرەی بیر و باوەڕێکی تری غەیری ئیسلام دادەڕێژێت ، ئەوکەسە لەنێو جەرگەی شیرکدا خول دەخوات . .

بەتەواوی پـێچەوانەی شـایەتوومانی ( لاالـه الا اللـه محمـد رسـول اللـه ) دەوەسـتێتەوە ، بـا پەرستنەکانیشی بهێنێتە دی . . ئائەمە خەڵکی ئەمڕۆ لێی بێ ئاگـان و ، بـێ دەربەسـتانە دەکەونە ناوی و گوێ ی نادەنێ . . چونکە ئەم خەڵکە نازانن کەئەم شیرکەی ئەوان ، هەر هەمان شیرکە کە کافرەکان لەهەموو کات و شوێنێکدا دەیانکرد ، مەرج نی یە بت هەر لەشێوەی سادەو ساویلکەی جاراندا بێت . . نـا . . ئەو دروشمانەی طاغوتێک بەرزیـان دەکـاتەوەو، دەیەوێ خەڵکی لەژێر ئالآیاندا کۆکاتەوەو ، بیناخاتە سەر دینێکی تر پێ ی ، جۆرێکن لەبت . . چونکە خۆ بتـی جـاران – وەکو ئاشکرایە – قسەی نەدەکرد و نەیدەبیست و نەیدەبینی . . بەڵام لەواقیعدا زێوانی بتەکـان (( ئەوی خزمەتی بت و بتگاکانی دەکرد )) و ئەوحاکمانەی دایان نابوون ، بەناوی بت و تەعلیماتی بتەکانەوە حوکمیان دەکـرد . . ئەوانەبـوون کەلە پشت بتەکـانەوە وێردیـان دەخوێنـد و مـوفەڕکی (موبـارەک) یـان دەبەخشـیەوە ! ئاشـکرایە کەهەر ئەمـان حـوکمی بتەکانیـان دەووت هەر ئەمـان دیاریان دەکرد کە ( جەنابی بت ) چی حەڵاڵ کردووە و چـی حەرام کـردووە ! ئەمـڕۆش هەروایە . . هەزاران دروشم و هێماو لافیتەی بتین هەن کەزێوان و حاکم و سکرتێر و ڕیبەری حیزبەکـان لەژێـر ناوو لەپشتی ئەو دروشمانەوە حوکم دەکەن . . ڕێباز بەڵکو عەقیدە ئەم عەقیـدەش بـریتیە لەسـێ بەش . لەڕاستیدا ئەم ئیسلامە بۆ ئەوە هاتووە کە دووڕییانی نێوان کوفر و باوەڕ دیاری بکـات . . دووڕییـانی ڕێبـازی دینـی خـواو دینـی غەیـری خـوا . . تـا لەهەمـوو هەڵسـوکەوت و، ووت و ڕەوتێکدا هەڵوێستی بەرامبەر هەموو شتێک دیاری بکات . . لەهەموو کـارو کـردەوەو ڕەفتارێکـدا ، تا سروشتی سیستەم و ڕژێم و پڕۆ گرامەکانی هەموو زەمانێک بناسرێ . . تاسیستەم و پڕۆ گرامی زۆر خوا ناسین . . تا بناسێ ئایا وویست و مەبەسـتی ئەنجامـدان و ڕاپەڕانـدنی ئەو ڕژێمـانە بـۆ خوایە یا بۆ طاغووت و بت و دەسەڵاتدارە ریز پەڕەکانە .

---

## دیـــــن هەر شایەتمـــــان نی یـــە

ئەوانەی وادەزانن هەر بەوەندەی بەزمان دەڵێن {اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمد رسول الله} نوێژ دەکەن و ڕۆژوو دەگـرن و ژن هێنـان و طـلاق دان و میـرات گرییـان بەگـوێرەی ئیسـلام بەجـێ دەهێنن و ئیتر بەسە و هاتونەتە ( دینی خوا ) لەکاتێکدا کە مل کەچ و گـوێڕایەڵی شـەریعەتی وان کەخوای گەورە ڕێیـان پینـادات و زۆر بەی زۆریـان ئاشکرا دژی ڕیبـازی خـوان . . ئەوجـا لەسـەر ئەمەشەوە گیان و ماڵیان دەکەنە قوربانی بۆ ئەو ڕیبازە جاهیلی یانە ، تا ئاواتی بتی نـوێ بێـتە دی . . ئەوانەی ئەگەر بینییـــان دیـــن و ئـــابڕو دژی داوا کـــاری بڕیـــار و فەرمـــانی ئەم بتـــانە دەوەستێتەوە ، خێرا ئەو دین و ڕەوشتە دەخەنە لاوە تـا فەرمـانی ئەو بتـانە جـێ بەجـێ بکـرێ و تعلیمـاتی ئەوان ڕاپەڕێنرێـت . ئەوانەی ئـائەمە حـاڵ و هەڵسـوکەوت و هەڵوێسـتیانە و هەرواش دەزانن (لەدینی خوا)دان ، پێویستە بەهۆش خۆبێنەوەو چاک حاڵی بن و بـزانن کەلە چ شیرکێکی

گەورەو دیژواردان . . دینی خوا گاڵتە بازاڕ نی یە دینی خوا ئاوا لاواز و هیچ و پوچ نی یە وەک زۆر لەوانەی لافی ئیسلامەتی لێدەدەن و خۆیان بە موسوڵمان دەزانن و تێی گەیشتوون . . هەرگیز . . چونکە دینی خوا بەرنامەو پەیڕەو پرۆگرامی هەموو گۆشە و بارێکی ژیانی ڕۆژانەیە . . دینی خوا بریتی یە لەمل کەچی کردنی هەموو فەرمان و بەرهەڵستی یەکی خوای گەورە . . دینی خوا کە بریتی یە لەو ئیسلامەی ئەو نەبێ خوا هیچ دینێکی تر وەر ناگرێ ، ئەوەیە کە هەموو بارو دۆخ و گشت و بەشێک دەگرێتەوە . . بەپێ ی ئەو ئیسلامە خوای یەش شیرک تەنها لەبیر و هۆش و باوەڕ دا نیە ، بەڵکو پێش هەموو شتێک لەحاکم دانانی غەیری خوادایە . . لەوەدایە کە کەسێکی تر یا دەستوور و یاسایەکی تر لە گەڵ شەریعەتی خوا دا بکرێتە داوەر . . بت پەرستی بریتی نیە تەنها لەدار و تەختە پەرستن ، بەڵکو پێش هەموو شتێک بریتیە لە بەرز کردنەوەی ئالاو ڕێبازی غەیری ئیسلام و ، کۆکردنەوەی خەڵکی لەدەوریان و دان نان بەدەسەڵات دارێتی هێز و داوەرییان . باهەموو خەڵکی لەهەر وڵاتێک کەهەن سێری دەسەلاتی بالای وڵاتەکەیان بکەن و بزانن ، کێ خاوەنی ئەو دەسەڵاتەیە ؟ دینی ئەو وڵاتە چی یە و مل کەچی بۆ کێ دەکرێ و گوێ ڕایەڵی بۆ چی و بۆ کێ ؟ . دەردەبڕڕێ ؟ ئەگەر ئەمانە هەر هەموو بۆ خوا بوون ، ئەوا ئەوانیش لەدینی خوادان ، ئەگەر بۆ غەیری خوا بوون ئەوا باچاک بزانن کە لەدینی طاغووت و بت پەرستیدان ـ خوا پەناماندا ـ ((هذا بلاغ للناس و لینذروا به ولیعلما انما هو اله وا حد ولیذکر اولو الالباب))

---

## پەراوێـــزەکان :

((١)) بنوالنضیر جولەکە بوون لەمەدینە دەژیان کاتێک کە پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) تەشریفی هێنا بۆ مەدینە پەیمانی لەگەڵدا بەستن کە نەئەوان شەڕ لەگەڵ ئەماندا بکەن و نە ئەمانیش شەڕ لەگەڵ ئەواندا بکەن ، بەڵام ئەوان پەیمانەکەیان شکاند و ویستیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بکوژن بەوەی کە ویستیان بەردێکی گەورە لەسەر بانەوە بخەن بەسەر سەریدا ، بەڵام خوای گەورە ئەو پلانە گڵاوەی ئاشکرا کردن و پێغەمبەریش (ﷺ) هێزێکی کردە سەریان و ، دوای وارێک کەوتن کە مەدینە بەجێ بهێڵن و هەرچی دەشتوانن لەسەرووەت و سامان جگە لەچەک با لەگەڵ خۆیاندا ببەن و جا سەیر ئەوەیە ئەوشتانەی نەیاندەتوانی بیبەن تێکیان دەشکاند ، وەک خانوو ، دەرگا ، کەلێکیان هەڵدەوەشاند و دەیان ڕووخاندن .

((٢)) ئەم حەدیسە زۆر (ڕیوایەت) ی هەیە . . بەڵام دەقی ( صحیح ) ی کەئیمامی ( ابو داود ) ایمام (احمد) گێڕاویانەتەوە و شێخی (البانی) لە ( سلسلة الاحادیث صحیة ) لەژێر ژمارەی ( ٩٦٥) بەرگی دووەمدا هێناویەتیەوە . هەروەها لە ( صحیح الجامع الصغیر ) بەرگی شەشەم ژمارە ( ٣٧٢٦٨٠٣٥) دا بەم شێوەیە هاتووە : ( یشک ان تدعی علیکم الامم من کل افق ، کماتدعی الاکلة

اليقصعتها ، قيل : يارسول الله ! فمن قلةيمئذ ؟ قال لا،ولكنكم غثاء كغثاء السيل،يجعل الوهن في قلوبكم،وينزعن الرعب منقلوب عدوكم،لحبكم الدنيا وكراهيتكم الموت) ٠

((٣)) حەدیسی قودسی ئەو حەدیسەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەری بڕیوە بەوتەی خۆی ، بەڵام ئەصلی ماناکەی هی خوای گەورەیە ، وە بەزمانی ئەویشەوە دەیفەرموێ گێڕانەوەیشی لەلایەن ئێمەوە بەدوو عیبارەتە :

١. یان دەڵێن : (قال رسول الله (ﷺ)) فیما یرویه عن ربه) واتە پێغەمبەر (ﷺ) لەخوای خۆیەوە دەیگێڕێتەوە و دەفەرمووێ ٠
٢. یان دەڵێن (قال سبحان وتعالى في الحديث القدسي) واتە : خوای گەورە لەحەدیسی قودسیدا دەفەرموێت .

---------------

((٤)) ئەم حەدیسە پارچەیەکە لەحەدیسێکی قودسی درێژ کە ئیمامی ( مسلم ) گێڕاویەتیەوە .ئەمەش دەقە کەیەتی :

عن ابي ذر الغفاري – رضي الله عن – عن النبي (ﷺ) فيما يرويه عن ربه عز وجل انه قال : {ياعبادي اني حرمت الظلم على نفسي وجعلته بينكم محرما فلاتضالموا ، ياعبادي كلكم ضال الا من هديته ساستهدوني اطعمكم ، ياعبادي كلكم عار الا من كسوته فاستكسوني اكسكم : ياعبادي انكم تخطئون باليل والنهار وانا اغفر ذنوب جميعا فاستغفربت اغفر لكم ، ياعبادي ، انكم لن تبلغوا ضري فتضروني ، ياعبادي ، لو ان اولكم وآخركم وانسكم وجنكم كانوا على اتقى قلب رجل واحد منكم مازاد ذلك في ماكي شيئا ، ياعبادي ، لوان اولكم وآخركم وانسكم وجنكم كانو على افجر قلب رجل واحد منكم مانقص منلكي شيئا ، ياعبادي ، لوان اولكم وآخركم و انسكم وجنكم قامو فيصعيد واحد فسالوني فاعطيت كل واحدمسالته مانقص ذلك مماعندي الاكما ينقص المحيط اذا ادخل البحر ، اياعبادي ، انماهي اعمالكم احصيها لكم ثم اوفيكم اياها فمن وجد خيرا فليحمد لله ومن وجد غير ذلك فلايلومن الا نفسه }.

((٥)) داگیرکەرە ئیمپرالیستەکان ناوی خۆیان نابوو ئیستیعمار (واتە ئەوانەی کەدەیانەوێت وڵات ئاوەدان بکەنەوە) تائاسانتر فریومان بدەن و گاڵتە بەعەقڵمان بکەن !! لالۆ زوەیمەریش بێگومان ئا بەم پێناسەیە ئیستیعمار باس دەکات ٠

((٦)) لەگۆڤاری (الفتح )دا لەژمارەی ئەوساڵانەدا کەئەم کۆنگرانەی تێدا دەگیرا بە دور و درێژی دەقی ئەم کۆنگرە و ئەوانی تر باس کراوە (١٩٥٥،١٩٢٤،١٩٠٦) ٠

((٧)) گۆڤای (المسلمون) ژماره (٤) ل( ١٩٥٥) ٠

((٨)) لاپەڕە (٤١) لەکتێبی ( الاسلام علی مفترق الطریق ) ٠

((٩)) ئیمامی نسائی لە ئەبو سعیدی خودریەوە گێراویەتیەوە لەکتێبەکەیدا السنن ـ باب الجهاد ـ ٨
هەروەها ئیمامی ئەحمەد : ٤٢/٤ ـ ٥٨

((١٠)) گۆڤاری (المسلمون) ژماره (٧) ساڵی (١٩٠٤) لاپەڕە (٤٢)٠

================================================================

## "مافی لەچاپ دان و بڵاوکردنەوەی پارێزراوە بۆ وەرگێڕ"

================================================================

## کـۆتـایی

الحمدلله رب العالمین .. بەیارمەتی خوای گەورە گەیشتین بەکۆتایی و تەواو کردنی ئەم کتێبە ، خستنە بەردەستی ئێوەی ئازیز بەو هیوایەی کە جێگای ڕەزامەندی خوای پەروەردگار و سوودی ئێوەبێت ـ لەدوعای خێر بێ بەشمان مەکەن .

---

**براتان : ڕێباز عبدالله**
**٢٠١٢/٧/١**
**السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته**

هەندێ لەدڵ نەرم و بە بەزەیەکانی ئەمڕۆ
عوزر دەهێننەوە بۆ ئەو خەڵکەی (بێ دین)یشن و
هەر بە موسوڵمان ئەیاندەنە قەڵەم و ئەڵێن :
ئەو خەڵکە بۆیە لەسەر ئیسلامیەتی نامێننەوە و
هەوڵ نادەن شەریعەتی خوا (بەوسیفەتەی کەدینە)
ڕاپەڕێنن ، چونکە نازانن (دین )یانی چی . .!
بۆیە دەبێ ئەگەر جاهیل و موشرکیش بن عوزریان
هەر قبوڵ بکرێت .
من تێناگەم ، نازانم ئەم خەڵکە لەڕاستی دینەکە
نەگەیشتوون ، چۆن لەسەرەتاوە خراونەتە بازنەی
ئەم دینەوە . .؟ ئاخر خۆ باوەڕ کردن بەڕاستی
هەر شتێک ، لقێکە لەزانین و ناسینی ئەو شتە .!

سید قطب

